# شەرعیات

مەستوورەی ئەردەڵان

وەرگێڕان و پەراوێز نووسینی:

نەوید نەقشبەندی

ناوی کتێب: شەرعییات
نووسینی: مەستوورەی ئەردەڵان
لێکدانەوە و پێشەکی و وەرگێڕانی: نەوید نەقشبەندی
پێداچوونەوە و هەڵەگری: ئاری محەممەد ساڵح (عەبدی)
ڕازاندنەوە و داڕشتنی: ئاری، ڤیان کامپیوتر
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٣٩٩
ڕووبەرگ: حەمید ئازموده
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٥
لە کتێبخانەی گشتیی لە هەولێر ژمارە (٧٣٥)ی ساڵی ٢٠٠٥ی دراوەتێ

بەش بە حاڵی خۆم ئەم کتێبە پێشکەش

دەکەم بە هاوسەری کابان و خۆشەویستم

و کچی جوانمان «شەیما»

# ناوەڕۆك

# پێشەکی

کتێبی «شەرعییات» یان «رسالەی شەرعیە»ی شاعیری بەنێوبانگی کورد (ماهشەرەف خانم) ناسراو بە (مەستوورەی ئەردەڵان) بە پێی بەڵگەیێکی زۆر دەبێ بە کتێبێکی تایبەتی لە مێژووی زانستی ئیسلامی لە کوردستان لە بەرچاو بخرێت. ئەم کتێبە ئەگەرچی قەبارە و بارستێکی زۆری نییە، بەڵام لە بواری زانستییەوە زۆر بەنرخە و شایستەیە کە زانایان لە چەند بواری جیاجیادا بیخەنە بەر پشکنین و لێکۆڵینەوە. بە تایبەت بۆ ئەو کەسانەی کە لە بواری مێژووی زانستە ئیسلامیەکان لە کوردستان خەریکی لێکۆڵینەوەن، ئەم کتێبە زۆر بابەتی سەرنجڕاکێشی تێدایە و پەردە لەسەر ژیانی زانستی و کتێبە سەرچاوەکان و ئاستی زانایانی ئەو سەردەمە لادەبات. هەروەها بۆ ئەو کەسانەش کە دەیانەوێ ژیانی کۆمەڵایەتی و کولتووری ئەو سەردەمە بناسن، ئەم کتێبە دەتوانێ زۆر یارمەتیدەر بێ.

بێگومان، ئەم کتێبە لە دەوروبەری ساڵەکانی ۱۲۵۵ تا ۱۲۶۲ی

مانگی نووسراوە، چوونکە یەکەم لە بەڵگە و شێوازەکان، و دووهەم؛ بە وردبوون لەسەر کتێبەکە وادەردەکەوێ کە خاتوومەستوورە ئەم کتێبەی لە کاتی پەرێشانحاڵی و ناموڕادیدا نووسیوە، خۆیشی دەڵێت: (لە ڕۆژێکدا کە گڵۆڵەی بەختم لە بێوەفایی دەوران کەوتبووە لێژی و شووشەی هەیبەتم بە بەردی ناڵەباری موقەدەری ڕۆژگار شکابوو، وە ڕۆژم بە وێنەی زوڵفی تازەبووکان شێواو بووە ڕۆژگارم وەکو خۆم بێ سەروسامان کەوتبووە دڵم بە تیری خەدەنگی فەلەك خوێناوی مابوو و کۆشکی بەختم بە دەستی گەردوونی ناڵەبار ڕووخابوو).

جا زۆرترین سەختی و بێتاقەتی و نارەحەتی مەستوورە لە ساڵی ١٢٥٥ دەستی پێکردووە، واتە کاتێك کە خوسرەوخان شووی مەستوورە، کۆچی دوایی کرد و خاتووو مەستوورەی ناسکخەیاڵی شووخۆشەویستی بەجێهێشت. بەڵام لەوانەیە بتوانین نەك بە یەقین بەس بە دوودڵی و بە گومانەوە مێژووی نووسینی ئەم کتێبە وردتر دیاری کەین و بێژین کە ئەم کتێبە لە دوای ساڵی ١٢٦٢ی مانگی کە ساڵی مردنی (ئەبولموحەممەد) برای خۆشەویستی مەستوورەیە نووسراوەتەوە. واتە دەوروبەری یەکسەد و شەست ساڵ لەمەوپێش کە مەستوورە خانم لەو کاتەدا تەمەنی ٤٢ ساڵ بووە.

بۆ باشتر ناسینی ئەم کتێبە دەبێ ئاوڕێ بەینە سەر ئەو سەردەمەی کە ئەم کتێبە نووسراوە و ژیانی خەڵکی لەو ماوەیە بناسین و بزانین زانایانی ئایینی ئەو سەردەمە کێ بوون و چۆن ژیاون و چیان خوێندووە؟ باشتر وایە باروودۆخی زانست و زانایان لەو سەردەمە زۆر بە کورتی لە بەرچاو بخەین تا بزانین مەستوورە وەختێ ئەم نامیلکەیەی نووسیوە، چی لە مێشکیدا گوزەراوە و چۆن

ژیاوە و بۆ نووسینی ئەم کتێبە چ کتێبانێکی لەبەرچاو بووگە.

دەزانین کە هەر لەو سەردەمەی کە یەکەمین گزنگی خۆری ئیسلام کەوتووە کوردستان (ساڵی ٢٥ مانگی)، کوردەکان زۆر باش ملیان نیا بەم ئایینە و بوونە موسوڵمانێکی باش. زانستە ئیسلامیەکان لە نێویاندا نرخ و بەهرەیکی زۆری هەبوو و ئەم ناوچە جوانەی کوردەواریە، زانایانێکی زۆری پێشکەش بە ئیسلام کرد کە بە بێگومان لە جیهاندا هیچ موسوڵمانێ ناتوانێ ئەو خزمەتانەی کە ئەم زانایانە بە ئیسلام و موسوڵمانان کردوویانە ڕەچاو نەکات یا لەبیری خۆی بەرێتەوە.

بۆ وێنە یەکێ لە زانستە ئیسلامیەکان، زانستی لێکۆڵینەوە و ناسینی فەرموودەکانی پێغەمبەری مەزنە(درودی خوای لەسەربێ) (علم‌الحدیث). بنچینەی ئەم زانستە وەکو زانستێکی ئیسلامی تا کاتی نووسینی کتێبی (علم الحدیث)ی ئیبنوسەلاحی شارەزووری (ابن‌الصلاح الشهرزوری) دابین نەکرابوو. کە دیارە تا پێش لەمە موسوڵمانان بەباشی نەیاندەزانی فەرموودەکانی پێغەمبەرەکەیان چۆن بناسن. هەروەها بۆ هەرکەسێ کە کەمترین تێڕوانینی بە سەر زانستە ئیسلامیەکان هەبێ، نێوی زانایانێ وەك سەیفەددینی نامێدی (سیف‌الدین الآمدي) و ئیبن‌خەلکان (ابن‌خلکان) و ئیبن ئەسیر (ابن اثیر) و شەهابوددینی ئالووسی (شهاب‌الدین الآلوسي) نێوانێکی زۆر ئاشنان کە هەموویان کورد بوون و هیچ کاتیش نەیانویستووە خۆیان بناسێنن. یاخۆ تا ئەم کاتانەی دوایش زۆرتری موفتیانی گەورەی وڵاتە ئیسلامیەکان دەبینین کە لە نێو کوردان هەلکەوتوون و کورد بوون. وەکو موفتی زەهاوی بابی شاعیری گەورە سیدقی زەهاوی کە زیاتر

له سی ساڵ له عێراقدا له ئاستی فتوادان بووه و له دوو مەزهەبی حەنەفی و شافیعیدا فتوای داوه. یاخۆ ئەو زانا گەورەی که ماوەیێکی زۆر نییه له نێومان نەماوه، واته خوالێخۆشبوو، مەلا عەبدولکەریمی موودەڕڕیس یا زۆر پێشتر لەمان عەللامه سنەیی‌زاده که ئەویش له ساڵانی ئاخری نیوەی دووهەمی سەدەی دوازدەهەم موفتی بەغدا بووه. یاخو ئەحمەدالحجی ئەلکوردی فتوادەری ئێستای کوەیت و موحەممەد موحیەدین ئەلقەرەداغی فتوادەری ئێستای قەتەر. یاخۆ زانا و وتاربێژ و فتوادەری بەناوبانگی مەککه له سەدەی دەیەمدا واته موحەممەدی کوڕی سولەیمانی کوردی که له ئێستاشدا له کتێبه فیقهییەکاندا به نێوی (الکردی) بەناوبانگه و فتواکانی به یەکێك له سەرچاوه گرنگەکان حسێب دەکرێت.

***

له ساڵانی ئاخری سەدەی دەیەمی مانگی بوو که زانستی ئیسلامی له کوردستان لاپەڕەیێکی تازەی به خۆی دی و هەر لەم سەدەیه بەرەو ژوور، به تایبەت له ناوچەی خۆرهەڵات زانایانێکی زۆرمان له مێژووی پان و بەرینی کوردی، پێشکەش به ئایینی ئیسلام کردووه.

واته له کاتی مەلا ئەبووبەکری موسەننیفی چۆڕی (الملا ابوبکر المصنّف الچوری) هاتووەته دنیا. واته نزیکەی سێ‌سەد و چل ساڵ پێش نووسینی کتێبی (شەرعیات)ی مەستوورەی ئەردەڵان له سنه.

له ساڵی ۹۰۹ی کۆچی مانگی که سێ‌سەد و یازده ساڵ پێش لەدایکبوونی مەستوورەی ئەردەڵانه، مەلا ئەبووبەکری موسەننیفی چۆڕیّ لەدایکبووه. ئەم زانا

پایەبەرزە یەکێ بووە لەو زانایانە کە لە زانستی ئیسلامیا سەرسوڕهێنەر بووە و تەئسیری زۆری کردۆتە سەر نەتەوەکانی دوای خۆی و تا چەندین ساڵ دوای مردنیشی هەر کاتێ نێو و یادی دەکرا، گەورەیی و شکۆی خۆی نیشان دەدا. زانایانی ناوچەکە، فتواکانی ئەویان دەست بە دەست دەگەڕاند و قسەی ئەویان بە لاوە بەڵگە (حجت) بوو. هەروەها بیروبۆچوونەکانی ئەویان لە زانستەکانی ئەدەب و مێژوو و هەروەها لێکدانەوەی قورئانی پیرۆز و فیقه و ئوسووڵ بۆ یەکتریان دەگەڕاندەوە. بە ڕاستی زانایەکی گەورە بووە کە تا چەندین ساڵ دوای مردنیشی لەم کتێبەی (شرعیّات)ی خاتووەمەستوورەش نێوی هاتووە و خاتوو مەستوورەش قسەی ئەوی بە بەڵگە داناوە. ئەم زانایە دوو نازناوی هەبووە (ئەبووبەکر) و (ئەبوو یووسوف). بەڵام زیاتر بە (ئەبووبەکر) نێوی دەرکردووە. نێوی خۆی سەی حەسەنە و لە نەتەوەی پیرخزری شاهۆیە. هەر ئەمەش بۆتە هۆی رێز و بایەخی زیاتری لە ناو خەڵکا. ناوچەی لەدایکبوونی بە وردی نەناسراوە، بەڵام دەزانین کە لە ناوچەی (کەڵاتەرزان) سەر بە شاری سنە هاتووەتە دنیا. ئەڵبەت لەو کاتەدا سنە هێشتا نەکراوەتە دارالایالە، و حکومەتی ئەو سەردەمە لە قەڵای حەسەناوا بووە کە لە خۆرنشینی سنە زۆر دوور نیە.

مەلا ئەبووبەکر تا دواترین ساتەکانی تەمەنی بەهرەیێکی زۆری لە ماڵی دنیا نەبوو، و نە لە دڵ و نە لە ڕواڵەتیشدا دڵی بۆی نەدەچوو. پاش ئەوەی کە لە سەفەرێکی دوورودرێژ بە وڵاتانی میسر و شام و عەرەبستان، دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان، لە قوتابخانەی مەدرەسەی (جامع‌السور) کە ئەمیرحەمزەی بابانی

دروستی کردبوو خۆی بە دەرس وتنەوە خەریك دەکا و ئەمیرەکانی بابانیش - هەروا کە عادەتیان بووە کە لە زانایانی ئایینی ڕێزیان دەگرت- ڕێزی زۆریان لێ گرتووە. هەر لەم قوتابخانەیشدا بوو کە کتێبی ئەلوزوحی (الوضوح)ی نووسیوە کە یەکێکە لە سەرچاوەکانی نامیلکەی شەرعیاتی مەستوورە. هەر لەم ساڵانە هەڵۆخان لە قەڵای حەسەناوای دەوروبەری شاری سنە، حکومەتی دەکرد. هەڵۆخان زۆر مەلا ئەبووبەکری موسەنیفی خۆش دەویست. بەشێ لە زەویەکانی داوێنی کێوی لە دەوروبەری شاری مەریوانی بە مەلائەبووبەکر بەخشی. جا لەبەر ئەوەی کە ئەو زەویانە ئاو و ڕووبارێکی چۆڕ و ڕەوانی تێدابوو نێویان نا چۆڕ و لەو کاتەوە دێی چۆڕ دروست کرا. نەتەوەکانی مەلائەبووبەکر ئێستاش لەم دێهاتە دەژین.

مەلائەبووبەکر عەرەبی‌زان و فارسی‌زانێکی باش بوو. بە هەر دوو زمانەکە دەیخوێند و دەینووسی. ئەیدەویست خۆی ببەستێ بەو مەڵبەندە کولتووری و سەقافیە کە زانایانی ئەو سەردەمە تێیدا بیریان دەکردەوە. لە زۆر باس و بابەتی‌تریشدا زانیاری هەبوو. بە تایبەت کە بۆ زۆر شوێن سەفەری کردبوو و لە سەرچاوەی زانستی و کتێبگەلێکی زۆر کەڵکی وەرگرتبوو. کتێبی بە نرخی (طبقات الشافعیە) بەڵگەیە لە سەر توانا و ئاگاداری و بۆچوون و شێوازی جوانی ئەو لە نووسیندا. (سراج‌الطریق) و (ریاض الخلود)ی بە فارسی نووسی، کە یەکەمیان لە بواری تەسەوف و عیرفانە، و دووهەمیان بریتیە لە کۆمەڵێ چیرۆك و داستانی جوان. هەروەها کتێبێکی‌تری بە زمانی فارسی هەیە بە نێوی (آفتاب) کە چەکامەیێکە (منظومە) لە پەسنی پێغەمبەردا[٤٠]. گرنگترین

کتێبی فیقهی ئەو، (الوضوح)ە لە چوار بەرگدا کە ئەگەرچی زیاتر شەرحی کتێبی (محرر)ی ڕافیعیبە بەڵام لە نێوانیدا زۆری لە ڕا و بیروبۆچوونی خۆیشی تێدایە.

***

جگە لە (مەلائەبووبەکر موسەننیف) وڵاتی کوردستان زانایانی زۆری لە داوێنی خۆیدا پەروەردە کردووە، بەڵام —لەگەڵ ڕێزێکی کە بۆ هەموویان دەگرین- ڕەخنەیکمان لە زۆربەیان هەیە. ئەویش ئەمەیە کە زانیاریەکانی خۆیانیان نەنووسیوە تا ئەوانەی بە شوێنیاندا دێن بیانناسن و نێویان بزانن و ڕێزیان لێ بگرن تا بە دنیا بڵێن کە لە باوەشی پڕ لە مێهری کوردستان چ زانایان و پسپۆڕانێ ژیاون. مەلائەبووبەکریشیان هەر لە بەر ئەوە نێویان ناوە (مصنّف) واتە نووسەر، کە دەستی بۆ قەڵەم بردووە و چەند کتێبێکی نووسیوە. ئەگەرنە خودا خۆی دەزانێ کە چەندە هەزار زانای گەورە لەم وڵاتەدا ژیاون کە لای کەم ناویشیان نەماوە و هیچ کەسیش هەر ناویان نازانێ. بگرە ئەگەر مەلائەبووبەکریش شتێکی نەنووسیبا، هیچ کات ئەویشمان نەدەناسی.

یەکێ لە ئەسبابەکانی نەمانی نێوی ئەم زانایانە ئەوە بووە کە هیچ کتێب و نامیلکە و بەڵگەیکیان لە خۆیان بەجێنەهێشتووە تا ئێمە بیانناسین. زۆربەی لەم زانایانە خۆیشیان نەیانویستووە ناویان بەجێ بمێنێ، چونکە بەناوبانگ بوونیان بە لاوە عەیب بووە، و هەروەها کە ڕەهبەرانی ئاینیش وتوویانە کە باشتر ئەوەیە کە کەس نەیانناسێ و ئەگەر بە ئەستۆی خۆیانیان زانیوە کە زانستەکانیان بڕژن، بیشتر هەوڵیان داوە بە نووسینی کتێبی شەرح لە سەر کتێبە گەورەکان، ڕای و پێچوونی خۆیان بە خەڵکی بڵێن. چونکە ئەوەی کە

گرنگە گەیاندنی بابەتەکان و ئەمانەتی ئایین و زانیاری و فیقە بە موسوڵمانانە نە ئەمە ناوی کەسێ لە دنیا دەرچێ.

هەر چۆنێ بێ زانایانی هاوسەر و ئەوانەیش کە لە دوای مەلائەبووبەکر هاتوون، مەلا ئەبووبەکریان وەکو ئیمامی نەوەوی و ئیمامی غەزالی داناوە کە فتواکانی بە تایبەت بۆ کوردەواری بەنرخ و جێگای بیرکردنەوەیە. چونکە مەلائەبووبەکر بە جوانی و دروستی دەیزانی کە مەسەلا ئەو فتوایانە کە چەندسەد ساڵ پێش ئیمامی نەوەوی (خوای لێ ڕەزا بێ) بۆ کابرای عەرەبی دەشتەکی فەرموویەتی، نە ئەتوانین و نە دروستە بۆ کوردی ژیار لە کێوە جووانەکانی کوردستان، بە کاری بێنین. دەبێ داب و فیکر و کولتووری هەر نەتەوەیێك لە فتواداندا لەپێش‌چاو بکرێ. بۆ نموونە مەلا ئەبووبەکر فەرموویەتی تور یەکێکە لەو شتانەی کە دەبێ وەکو قووت لەبەرچاو بێ و زەکاتیشی لێ دەکەوێ. هەر لەم کتێبەی خاتووەمستوورەش -کە مەلا ئەبووبەکری بە (قدوة العلما) ناو ناوە- ئەم فتوا دەکەوێتە بەر چاومان. ئەم فتوایە زۆر مەسەلە بۆ ئێمە ڕوون دەکاتەوە کە سادەترینیان ئەوەیە کە مەلائەبووبەکری موسەننیف وەکو فەقیهێکی تێگەیشتوو و بە توانا و ڕۆشنبیر ڕا و بیروبۆچوونی وەهایە کە حوکمە فیقهییەکان بە پێی هەل و مەرج و گۆڕانی زەمان و شوێن و فەرهەنگ و کۆمەڵگا دەگۆڕدرێن.

مەلائەبووبەکر وەکو زۆری‌تر لە زانا گەورەکانی کورد، ئەمەی باش دەزانی بەڵام ئەمڕۆکە لە بواری ئیجتیهاددا ئەمە کەمتر ڕەچاو دەکرێ.

***

هەر لەم ساڵەدا کە مەلائەبووبەکری موسەننیفی چۆڕی لە دایك بوو، زانای

به نێو بانگ ئیبنو حەجەری هەیتەمی (ابن‌حجر هیتمی) لە میسر لە دایك بووگە.

ئیبنوحەجەری هەیتەمی کتێبێکی گرنگی لە فیقهی ئیمامی شافیعی نووسیوە بە نێوی (تحفة المحتاج بشرح المنهاج) کە تا ئێستاش گرنگترین و ووردترین سەرچاوەی فیقهی لە مەدرەسە و مەزهەبی ئیمامی شافعییە.

زۆرێك لە ڕا و فتواکانی ئیمامی نەوەوی لە (المنهاج)ی وەدەر هێناوە و خستوویەتە بەر ڕەخنە و لێکۆڵینەوە، و فتوای تازەی بە دەست هێناوە. خوێندنەوەی کتێبی توحفە و توانای وتنەوە و وردکردنی وشەکانی، کە کتێبێکی قورس و گرینگە، نیشانەی پسپۆڕی و توانای زانستی هەر ماموستایێکە. ئیبنوحەجەر هەیتەمی قوتابی ئیمام زەکەریای ئەنساری بووە و ئەویش هەڤاڵی کاتی فەقێیەتی ئیبنوحەجەری عەسقەلانی و هاوسەردەمی ئیمامی سیوتی بووە. توحفەی ئیبنوحەجەر بەردەوام سەرچاوەیەکی گرنگی دەرس وتنەوەیە، و یەکێکە لە سەرچاوە گرنگەکانی مەستوورە خانم لە نووسینی کتێبی (شەرعیات)دا.

***

لە کاتێ کە ئیبنوحەجەر و مەلانەبوویەکری موسەننیفی چۆڕ، لە تەمەنی چلودوو ساڵیدا بوون، لە دێیەك لە دەوروبەری شاری سنە بە نێوی تەختە و لە خێزانێکی بەناوبانگ بە تەقوا و زانست و لە باوکێکی زانا و لەخواترس بە نێوی شێخ شەمسەددینی تەختەوی کوڕی شێخ عەبدول غەففاری ئەوەڵ کوڕی مەلاگوشایشی مەردۆخی، منداڵێ هاتووەتە دنیا کە زۆر بەناوبانگ بووە و بنچینەی بنەماڵەیێکی زانستی لە ناوچەی سنەوە ڕێك خستووە کە تا سەدان ساڵ

زۆربەی زانایانی ئایینی یان لەم بنەماڵە بووگن یان بە فەقێیەتی دەگەڕێنەوە سەر ئەم بنەماڵە. ئەم زاتە پایەبەرزە ناوی مستەفایە کە لە ساڵی ٩٥١ی مانگی لە دایك بووە و لە مێژوودا بە نێوی شێخ مستەفای تەختە دەناسرێت.

شێخ مستەفای تەختەوری مەردۆخی بە پلەوپایەیێکی زانستی بەرز گەیشتووە، و لەگەڵ نەتەوەکانی توانیویەتی لە کوردستاندا خزمەتێکی زۆر بە ئیسلام و خەلکی ناوچەکە بکا. ئەگەرچی لەو کاتەدا ساڵێ بوو کە دارالایالە هاتبووە سنە، بەڵام هێشتا بە شێوەی شارێك سەروسامانی لێ نەدرابوو. لەبەر ئەوە شێخ مستەفا بە پێی داب و عادەتی خوێندکارانی کورد سەفەری بۆ زۆر شوێن کردووە و تەنانەت چووەتە میسر و عەرەبستانیش. شێخ مستەفا لە ئەحسای عەرەبستان لە خزمەتی ئیبنوحەجەری هەیتەمی دەرسی خوێندووە و کتێبی توحفەی لە لای ئەو تەواو کردووە. لە زانای گەورە ئیبنوحەجەر داوای ئیجازەی دەرس وتنەوەی کردووە و ئەویش بڕوانامەی (اجازە) فتوادان و دەرس وتنەوەی پێ داوە. کەواتە، شێخ مستەفای تەختە لە نێو زانایانی کورد یەکەمین کەسە کە کتێبی توحفەی بە شێوەی دەرس، خوێندووە.

دواجاریش گەڕاوەتەوە بۆ دێی (تەختە) و تا ئاخری تەمەنی هەر لەوێ بە دەرس وتنەوە و فێر کردنەوە، خۆی خەریك کردووە. لە دواترین ساتەکانی تەمەنیدا گراوی تەریقەتی شێخ شەهابودینی کاکوزەکریایی بووە و ماوەیێك لە لای ئەو سولووکی کردووە. هەتا وەکو ئیجازەی ئیرشادیشی لێ وەرگرتووە. شێخ مستەفا خاوەنی جەزبەی ڕۆحی و زانستێکی شەرعی تەواو بووە و لە هەر دوو بوارەکەدا توانای زۆری بووە. لە پەسنی پێغەمبەر(د.خ)وە هەروەها بابەتەکانی

تەسەووف (عیرفان)دا شیعری کوردی زۆری هەیە. شێخ مستەفای تەختە دوو کوڕی هەبووە، نێوی یەکێکیان ئەحمەد بووە و بە شێخ ئەحمەدی عەللامە بەناوبانگە و نەوەیتریان شێخ ئەبووبەکر بووە کە لە تەختە ئەماوە و ڕۆیشتووە بۆ دێهاتی کاشەر. لەوێ بنەماڵەی کاشەرییەکانی دامەزراندووە کە عالم و عارفی زۆریان تێدا هەڵکەوتووە وەکو: شێخ حەبیبوڵلای کاشەری کە بارکی بابامەردۆخی ڕوحانی نووسەری کتێبی (تاریخ مشاهیر کرد)ە و مامۆستای عەبدولحەمید بەدیعوزەمانی مەعی‌سەنەندەجی)ە.

شێخ مستەفا لە مێژووی زانستە ئیسلامیەکان لە کوردستاندا و بە تایبەتی لە ناوچەی سنە، کەسایەتییێکی زۆر بەرچاو گیرە. شێخ مستەفای تەختە لە ساڵی ١٠٤٧ی مانگی لە دنیا دەرچوە و ئێستاش گلکۆی لە ناوایی ئەختەیە لە نزیکی سنەیە. واتە یەکسەد و حەفتا ساڵ پێش نووسینی کتێبی (شەرعیاتی) خاتوو مەستوورەی ئەردەڵان.

* * *

لە کاتی لە دنیا دەرچوونی شێخ مستەفا یەك ساڵ بە سەر هەڵبژاردنی سنە وەکو بنکەی ویلایەت تێپەڕ ببوو. واتە سەد و حەفتا و چوار ساڵ پێش لە دنیا هاتنی خاتوو مەستوورە، لە ساڵی ١٠٤٦ مانگی، سەردەمی شاسەفی کە لە شاکانی زنجیرەی سەفەویە، سولەیمانخانی ئەردەڵان، سنەی بە دارالایالە هەڵبژارد و بنکەی حکومەتی لە حەسەناوارە بەرەو ئەوێ هێنا. لە شارۆچکەی سنەی ئەو کاتە هۆزی «زەڕڕین کەفش» نیشتەجێ بوون. بەڵام چەند سەد ساڵ پێش ئەم بەسەرهاتنە، سنە شارێکی گەورە و ڕازاوە بووە. بە پێی

لێکۆڵینەوەکانی مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی ناوی قەدیمی شاری سنە (سی‌سەر) بووە کە لە سەردەمی عەباسیەکاندا بنەڕەت نراوە.

هارونالرشید بە ڕاوێژی پزیشکە کوردە مەسیحیەکانی خۆی، ئەم ناوچەیە بۆ هاوینەهەوار و شوێنی سەیران و حەسانەوە بنیاتی نا، و لە هەورامیەکان، کە لەو کاتەدا ئەم ناوچە لە ژێر دەسەڵاتیاندا بوو، ستاندی. بە دوو بەڵگە دەتوانین ئەم قسە بە ڕاست بزانین. یەکەم: ئەوەیە کە دائیرەتولمەعارفی بریتانیکا، لە تێکستی ئینگلیزی خۆیدا هەر ئەم باسە دەکات و بەڵگەی بۆ دەهێنێتەوە کە ئێرە جێی باسی نیە. دووهەم بوونی چەند ئاسەواری کۆن وەکو مەرقەدی (هاجەرەخاتوون) خوشکی ئیمام ڕەزا لەم شارەیە. چونکە دەزانین کە ئیمام ڕەزا و کەسانی لە موڵك و دەسەڵاتی هارونالرشیدا جێی ڕێز و ئیحترام و شکۆیەکی زۆر بوون. باقی ئیمامزادەکانی‌تری سنە زیاتر وادەردەکەوێت یادگاری ئەو زەردەشتیانە بن کە لە دەوروبەری کێوی (ئاویەر) یا بە پێی بەڵگەکانی زەردەشتی (ئاویشتەرە) بە خاك سپێردراون. کێوی ئاویەر بۆ زەرتوشتیەکان جێی ڕێزە و شوێنێکی تایبەتیە، کە گوایە دووهەمین شوێنی هاتنە خواری سرووش (وحی) بۆ لای زەردەشت بووە.

بەڵام ئەوەی لێرەدا بۆ ئێمە گرنگە ئەوەیە کە شێخ مستەفا خاڵی دەست پێکردنە لە نێوان ئەو زنجیرە زانایانەدا کە تا چەند سەد ساڵ لەوەو دوا لە ئاستی دەرس وتنەوە و فتوا لە کوردستان بە تایبەت ناوچەی سنە دانیشتوون. بێ‌گومان بە بێ‌ناسینی ئەم بنەماڵە لاپەڕەی مێژووی ناوچەی سنە بە تەواوی نانووسرێت.

تا سەرەتاکانی سەدەی چواردەهەمی کۆچی، سەرۆکایەتی زانستی ئایینی لە سنە و دەوروبەری بە دەستی ئەم بنەماڵەوە بووە و کەسانێکی زۆر لە لای ئەم زانایانە بڕوانامە و ئیجازەیان وەرگرتووە.

هەر وا کە وتمان یەکێ لە کوڕانی شێخ مستەفای تەختە، ئەحمەدی ناو بووە کە دواتر بە شێخ ئەحمەدی عەللامە ناوبانگی دەرکردووە و لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا لە ساڵی ١١٣٤ کۆچی دوایی کردووە. ئەم شێخ ئەحمەدە خاوەنی زەوق و قەریحە بووە و نە تەنها بە زمانی فارسی و عەرەبی نووسراوەی و هۆنراوەی هەیە، بەڵکو لە یەکەمین زانایانی ئەم ناوچەیە کە بە زمانی کوردی شیعری هۆنیوەتەوە.

چەند ساڵێ دوای مردنی شێخ ئەحمەدی عەللامە حکومەتی سەفەوییەکان لە ئێراندا ڕووخاوە و بنەماڵەیان نەماوە. بەڵام دوایین ساڵەکانی تەمەنی ئەم زانا گەورەیە لە مشتومڕ و شەڕوشۆڕی حکومەتی عەلیقوڵیخانی ئەردەڵان و خانەپاشای باباندا تێپەڕیوە. لە ساڵی ١١٣٢دا خانە پاشای بابان لە سولەیمانییەوە بەرەو مەریوان و لەوێش بەرەو سنە هێرش دەبا و عەلیقولیخان بە چۆکا دێنێت و شکستی دەدا. خانە پاشای بابان لە کەرکووکەوە تا هەمەدان لە ژێر دەسەڵاتیدا بووە و هەوڵی زۆری داوە کە خەڵکەکە دڵخۆش کات و خەڵکی لە سەردەمی ئەودا ئاسایش و هێمنایەتیان بووە. خانەپاشا لە شاری سنە مزگەوتێك بە منارەیێکی جوانەوە لەگەڵ قوتابخانەیێکی گەورە بنیات دەنێت کە ئەمانوڵلاخانی ئەردەڵان لەبەر تەعەسوب و دەمارگیری وێرانی کرد و لە شوێنێکیتردا مزگەوت و قوتابخانەی دارولئیحسانی کردەوە. لە کاتی هێرشی

خانمپاشا بۆ سەر شاری سنە، شێخ ئەحمەدی عەللامە ٧٩ ساڵ تەمەنی بووە.

شێخ ئەحمەدی عەللامە دوو کوڕی هەبووە. شێخ موحەممەد وەسیم و شێخ مەحموود. شێخ موحەممەد وەسیم زانایەکی بەڕێزە و بەناوبانگ بووە کە سنەی بەجێهێشتوە و ڕۆیشتووە بەرەو کوردستانی خۆرنشین. ماوەیەکی زۆری لە بەغدا بە سەر بردووە و لە کۆتایی تەمەنیدا لە قەڵاچوالان ژیاوە، لەوێ نازناوی عەللامەی قەڵاچوالانی پێ دراوە. بە پێی فەرمودەی بابا مەردۆخ لە (تاریخ مشاهیر)دا بیست و دوو کتێبی بووە و قەبریشی لە قەڵاچوالانە.

شێخ مەحموودی کوڕی شێخ ئەحمەد، کوڕێکی بووە بە ناوی ئەحمەد کە بە شێخ ئەحمەدی دووەم بەناوبانگ بووە. شێخ ئەحمەدی دووهەم لە ساڵی ١١٠٦دا لەدایك بووە و لە ساڵی ١١٨١دا کۆچی دوایی کردووە. ئەم شێخ ئەحمەدە لە مێژووی زانیاریە ئیسلامیەکاندا لە کوردستان گرنگییەکی زۆری هەیە کە دواجار باسی ئەکەین.

***

کاتێ کە ئەم شێخ ئەحمەدی دووهەمە لە تەمەنی پیریا بووە، لە شوێنێ دوورتر لە کوردستانی باکووردا، لە دەوروبەری سەردەشتدا، زانایەکی گەورە ژیاوە کە ناوی مەلا موحەممەدی ئیبنولحاج (ابن‌الحاج) بووە. زانایەکی زۆر زیرەك و دانایەکی گەورە و مامۆستایەکی پایەبەرز بە تایبەت لە زانستی کەلامدا کە لەقەبی (عەللامەی کەلامی) پێدرابوو. ئیبنولحاج لە نزیکەی ساڵی ١١١٩دا لە دێی سنجوی لە دەوروبەری سەردەشت لەدایك بووە. زانستە ئایینیەکان فێر بووە و هەر لەوێش خەریکی پەروەردەی قوتابیان بووە. لە ئاخری تەمەنیدا بەرەو

دێی هەزارمێرد لە ناوچەی سولەیمانی کۆچی کرد و لە دەوروبەری ساڵی ١١٩٩دا بوو کە ئەم دنیایشی بەجێهێشت.

کۆچی دوایی ئیبنولحاج بیست یا بیست و پێنج ساڵ پێش لەدایکبوونی مەستوورەی ئەردەڵان بووە.

لە لایەنی فیقهییەوە دەتوانین ئیبنولحاج لە ڕیزی مەلائەبووبەکری موسەنیفی چۆڕ و شێخ مستەفای تەختە دابنێین. بە تایبەتی کە وەك مەلائەبووبەکری موسەنیف، خاوەنی بیروڕای تایبەتی لە فیقهدا بووە، تا ڕادیەك کە کتێبێکی سەبارەت بە نەکەوتن و مونئەجەز نەبوونی زۆرێك لەو تەلاقانەی کە خەلکی عەوام دەیخۆن و دەیخەن نووسیوە بە ناوی (ایقاع الضرام علی من یوقّع طلاق العوام).

ئیبنولحاج بە باشی تێگەیشتبوو کە زۆرێك لەو تەلاقانەی کە بە زاری خەلکی عەوامدا دێت بەهەرمێکی لە نیەت و ویستی قەلبی نییە. بەلام بە داخەوە زۆرێك لە مامۆستایانی بەرێزی ناوچەکە ئەو تەلاقانەیان بە کەوتوو زانیوە و زۆر جار لەوانەیە بوونەتە هۆی لێك هەلوەشانی چەندین ماڵ و خێزان. تێگەیشتنی ئەم باس و بابەتە و لادان لەوەی کە زۆرتری مامۆستاکان وتویانە و بە دروستیان زانیوە، ئاماژە دەکاتە توانای عیلمی و ڕاستگۆیی و سەراحەتی لەهجەی ئیبنولحاج. بابەتێکیتر لە بارەی توانای فیقهی ئیبنولحاجەوە، دوو نامیلکەیە لە باس مەعنای زۆر بۆ هێنان یان (اکراه)ی شەرعی بە ناوی (الرسالةالصغری) و (الرسالةالکبری) و نامیلکەیەك کە لە بواری نیکاحی مۆتعەدا نووسیویەتی. کتێبێکیتری ئیبنولحاج بریتییە لە (رفع‌الخفا في شرح

ذات‌الشفا) که لەم چەند ساڵەی دواییدا بە پێشەکیەکی جوانی مەلا عەبدورەئوفی نەقشبەندی سەردەشتییەوە لە ئێران بڵاو کراوەتەوە.

بابەتێکی سەرنجڕاکێش لە بارەی ئیبنولحاجەوە ئەو شیعرە کوردیانەن کە لە پاش ئەو بەجێماوە کە لە پاڵ شیعرە کوردیەکانی شێخ مستەفای تەختە و مەلانەبوویەکری موسەنیفی چوڕدا جێی باس و وردبوونەوەن.

ئیبنولحاج قوتابیانی زۆری پەروەردە کردووە کە لە مێژووی زانستە ئیسلامیەکان لە کوردستان، زۆر بەناوبانگ و ناسراون، لەوانەش عەللامە مەلا عەبدوڵڵای بیتوشی و عەللامە شێخ مەعروف نۆدێی بەرزنجی.

سەبارەت بە عەللامە بیتوشییەوە ناتوانم شتێکی زۆر بنووسم چونکە وادەزانم هەر چەندی لێ بنووسم و تەنانەت لە سەریشی بڕۆم و هەر چەندیش بیناسێنم هێشتا هەر هیچم نەنووسیوە. بەڵام لە لایەکی‌تر خەفەتی ناو نەبردنی ئەو بێ‌گومان بەسەر دڵمەوە دەمێنێتەوە. زانایەك کە بە درێژایی مێژووی ئیسلام کەمتر دەتوانین وێنە و نموونەیکی ئەو پەیدا کەین. چونکە هەم لە فیقە و ئوسوڵ و هەم لە ڕەوانبێژی (بلاغە)ی عەرەبیدا بێ‌وێنەیە.

زانا و ئەدیبێك کە لە کاتێ کە بە بیتوش هەڵدەخوێنێت، هۆنراوەکانی موتەنەبی و ئەبوونواس و گەورە پیاوانی شیعری عەرەب، خۆیان لە پشتی پەردەی شەرمدا دەشارانەوە و بە ڕاستی ئەگەر کوردستان زانایانی‌تری بێجگە لەو نەدەبوو بۆ شانازی خەڵکی کوردستان بەس بوو، و ئەگەر گەورەپیاوانێکی وەك عەللامەی بیتوشی بە وێژە و ئەدەبی عەرەبی -کە زمانی قورئانە- خزمەتیان نەکردایە لە کەنگێ عەرەبەکان دەیانتوانی بە زانستی عەرەبییەوە شانازی بکەن.

هەر وەکو داب و نەریتی زۆربەی زانایانی کورده هیچ کاتێ پلەوپایەی زانستی نەبۆته هۆی لەخۆ بایی‌بوونی. هەر لە بەر ئەویە کە لە ساڵی ١١٨٦دا کە لە تەمەنی ٥٠ ساڵیدا بووە دەگەڕێتەوە بۆ بیتوش و لەوێشەوە بە مەبەستی تازەکردنەوەی خۆشەویستی و ئەدەب بەرەو لای مامۆستای دێرینی خۆی عەللامە ئیبنولحاج بەرەو هەزارمێرد دەکەوێتە ڕێ و هەر لەوێش بووە کە شێخ مەعرووفی نەودێی کە لەو کاتەدا گەنجێکی بیست ساڵە بووە و لە لای ئیبنولحاج دەرسی خوێندوە بۆ یەکەم جار مەلا عەبدوڵڵا دەبینێ و ئێجگار گراوی وی دەبێت و ئەگەرچی مەلاعەبدوڵڵا تەنها یەك حەفتە لەوێ دەمێنێتەوە و دوای ئەوە بۆ هەمیشە کوردستان بەرەو ئەحسانی عەرەبستان بەجێ دەهێڵێت، بەڵام شێخ مەعرووف بەهرەی خۆی لێ گرتووە و هەتا هەتایە ناوی بە خێر و باشی لێ دەبا. مەلاعەبدوڵڵا ٣٥ ساڵ دوای ئەوە لە ساڵی ١٢٢١دا واتە کاتێك کە مەستوورە خانم تەمەنی یەك ساڵ بووە کۆچی دوایی دەکات.

بەڵام شێخ مەعرووف تا ساڵی ١٢٥٤ زیندوو بووە و تەمەنی موبارەکی ٨٨ ساڵ بووە. کاتێك کە خاتوومەستوورە لە ساڵی ١٢٢٠ لە دایك بووە شێخ مەعروفی بەرزنجی لە تەمەنی ٥٤ ساڵیدا لە سولەیمانی بووگە و ناو و بانگێکی زۆری هەبووە.

لەو ساڵانەدا ڕووهێنانی خەڵك بە زانستە ئیسلامیەکان ڕۆژبەڕۆژ لە پەرەسەندنا بووە. حکومەتی ئەردەڵانیەکانیش خوا لە بەر هەرچی، ئیحتیرامێکی زۆری لە زانایان دەگرت.

ئامانوڵڵاخانی ئەردەڵان لە ساڵی ١٢١٤، بە فەرمانی فەتحعەلی خانی

قاجار دەبێتە والی کوردستان. واتە ٨ ساڵ پێش لەدایکبوونی مەستوورە. ئەگەرچی ئامانوڵلاخان دەمارگیر (متعصب) و بێرەحم بوو، بەڵام ئەمیرێکی ئازا و دلێر و لێهاتوو و خاوەن ئیرادە و خاوەن هیممەت و تەبیعەتێکی بەرز بووە. زۆر حەزی لە ئاوەدان کردنەوەی کوردستان کردووە و مزگەوت و بازاڕ و حەمامی زۆری لە سنە دروست کردووە. یەکێك لەو کۆشکانە مزگەوتی بەناوبانگی دارولئیحسانە. کە ئێستاکە مزگەوتی جامیعی شاری سنەیە. کاتێك کە دروست کردنی ئەم مزگەوتە دوایی هاتووە مەستوورە خانم تەمەنی لە ٨ ساڵ زیاتر نەبووە.

***

لە ساڵی ١١٨١دا شێخ ئەحمەدی دووهەم کۆچی دوایی کردووە و دوو کوڕی بەجێ‌هێشتووە. لەگەڵ پێگەیشتنی زانستی و ناوبانگ دەرکردنی ئەو دوانە سنەیش بۆ خۆی دەبێتە مەڵبەندێکی زانستی گەورە لە ناوچەکەدا و هەر ئەو دوو کوڕە سەرپەرشتی و بەڕێوەبەرایەتی زانستی ناوچەکە دەگرنە دەست. شێخ موحەممەد قەسیم و شێخ موحەممەد سەعیدی تەختەوی مەردوخی.

شێخ موحەممەد سەعید کە برای بووچك بووە، لە ساڵی ١١٥٢ لە دایك بووە و دوای ٨٤ ساڵ تەمەن لە ساڵی ١٢٣٦دا لە سنە کۆچی دوایی کردووە. لە زانیاریەکانی فیقھ و ئوسوڵ و فەلسەفە و کەلام و ڕیازیاتدا زانایەکی بەتوانا بووە. شێخ موحەممەد سەعید پێش لە سازکردنی مزگەوتی دارولئیحسان لە مزگەوتی بابانیەکاندا خەریکی تەدریس بووە و دوای بنیاتنانی دارولئیحسان و هەڵوەشاندنی مزگەوتی بابانیەکان هاتە ئەوێ. بەڵام گرنگترین و بەنرخترین

شتێك كه دوای ئەو بەجێما، چوار كوڕی بەناوبانگ و زانای ئەون، شێخ عەبدولقادری موهاجیر و شێخ موحەممەد وەسیم و شێخ موحەممەد نەسیم و شێخ موحەممەد جەسیمی حجەالاسلام.

سەبارەت بە شێخ قەسیم دەبێ بڵێین كه زانایەكی بەناوبانگ و عالمێكی هەرەبەرز و شارەزا بووە بە تايبەت لە بواری پەروەردەكردن و تەدریسی زانستە ئیسلامیەكاندا، زۆر فەقێهی پایەبەرزی پێگەیاندووە. كۆمەڵێكی زۆر لە پیاوانی خاوەن فەزڵ لە لای ئەو دەرسیان خوێندووە، وەكو عارفی بەناوبانگ مەولانا خالیدی شارەزووری، كه لە خزمەتی شێخ قەسیمدا بڕوانامە و ئیجازەی فتوا و تەدریسی وەرگرتووە و زانستەكانی حیكمەت و ریازیات و ئەستێرەناسی لە لای ئەو خوێندووە. ئامانوڵلاخانی ئەردەڵان دوای دروست كردنی مزگەوتی دارولئیحسان، لە شێخ قەسیم و شێخ سەعید دەعوەتی كردووە بۆ ئەوەی لە دارولئیحسان دەرس بڵێنەوە. ئەمە كه بنەماڵەی شێخ قەسیم، لە چەند سەد ساڵی رابردوودا تاكو ئێستا، ئاستی دەرس وتنەوەی زانستە ئایینیەكانیان لە ناوچەی سنە وەئەستۆ گرتبوو، بووە هۆی ئەوە خەڵكەكە رێز و ئێحترامێكی زۆری لێ دانن. زانایان و هۆنەرانی زۆر، شیعر و كتێبیان لە پەسنی ئەودا هۆنیوەتەوە و نووسیوە كه خاوەنی كتێبی (اصفی الموارد فی سلسال احوال الامام مولانا خالید) لە ژێر ناونیشانی (مولانا الشیخ محمد قسیم السنندجی الشافعی الاشعری) هەندێ لەو شیعر و نووسراوانەی هێناوە. (بوجە سنندج امسی منیرا كبدر لاح فی افق وهلاً...).

عەللامە شێخ قەسیم لای زۆرێ لە زانایانی بەناوبانگ دەرسی خوێندوە و

بۆ فێربوونی زانستی ئیسلامی سەفەری زۆری کردبوو. هەندێك لە مامۆستاکانی بریتی بوون لە: مەولانا عەبدولقادری سیسی ئەردەڵانی و شێخ موحەممەد وەسیم تەختەوی و عالمی گەورەی شافعی لە دمەشق شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ عوبەیدی عەتتار کە شێخ قەسیم خۆی دەڵێت کتێبی ئەربەعینم لەو سەماع کرد. شێخ قەسیم لە دوای سەفەرێکی زۆر، گەڕاوەتە سنە و دەستی کردووە بە دەرس وتن بە تولڵاب. لەو ماوەیە کەسانێکی زۆر لە لای ئەو خوێندوویانە، وەکو مەولانا خالید و مەلا عەلی زێباری. شێخ لە زەمانی لەدایکبوونی مەستوورە بە ٧٧ ساڵ تەمەنەوە زانای گەورەی شار بوو. کاتێك کە مەستوورە ١٦ ساڵ تەمەنی بوو ئەو کۆچی دوایی کرد. لە لاواندنەوەی ئەودا شیعری زۆریان هۆنیوەتەوە. بۆ وێنە خورڕەمی کوردستانی لە ماوەی مێژووی لەدنیادەرچوونی ئەودا لە چەکامەیەکدا وتوویەتی: «واویلا نگون شد رایت علم. واتە: ئەی هاوار ئاڵای زانست کەوتە خوارەوە» کە فارسیەکەی بەرامبەر بە ساڵی ١٢٣٦ دەرئەچێ.

دەس ڕۆیشتن و توانایی عیلمی شێخ قەسیم بێهاوتا و زیاتر لەوە بوو کە کەسێ بتوانێ لەگەڵ ئەو بەرابەری بکا، بە تایبەتی کە خواترسی و ڕەوتی قسە و پێشینەی بنەماڵەی، ئەم زانایەی گەورەتر نیشان ئەدا. لە خواترسی و بێفیزی شێخ قەسیم ئەو کاتە بۆ خەڵك زۆرتر ڕوون دەبێتەوە کە بزانن شەش ساڵ پاش ئەوە واتە لە ساڵی ١٢٢٦دا کاتێك مەولانا خالید گەڕایەوە بۆ سنە و گەیشتە خزمەتی مامۆستای دێرینی خۆی لە بارەی سەفەرەکەی خۆی و بەسەرهاتی بۆی گێڕایەوە. شێخ قەسیم لەو کاتەدا زیاتر لە هەشتا ساڵ تەمەنی بوو بەڵام هێشتا

گوڕی زانین و زانستی تێدا بوو. له ولاّمی مەولانا خالیدا تەرغیبی کرد و کارەکەی بەلاوە باش بوو. لەو کاتەدا مەولانا خالید نزیکەی ۳۳ ساڵ تەمەنی بوو. ئەڵبەتە پێشینەی ئاشنایی و پەیوەندی بنەماڵەی تەختەوی لەگەڵ تەریقەت دەگەڕێتەوە بۆ چەندین ساڵ لەوە و پێش.

باشتریشە بزانیـن کە تەریقەتی نەقشبەندی چەندین ساڵ پێش سەفەری مەولانا خالید بۆ هیند، هاتبووە ناوچەکە و مەولانا یەکەمیـن کەس نەبووە کە بۆ کەسبی تەریقەت بەرەو ئەو دیارە ڕۆیشتووە.

دوای شێخ موحەمـمەد قەسیم حاجی شێخ جەمالەددینی دووهەمی مەردۆخی سنەی بووەتە پێشنوێژ و خوتبەخوێنی شاری سنه و تا ساڵی لەدنیادەرچوونی واتە ١٢٥٦ خەتیب بووە.

تا ساڵی ١٢٣٠ بنەماڵەی ساداتی شێخولیسلامی لە ناستی شێخولیسلامی لە سنه دادەنیشتن. بەڵام لەو تاریخە بە دواوە بە زۆر و بە سیاسەتی ئامانوڵلاخان ئەم جێگە و مەقامە درا بە بنەماڵەی مەوالی. هەر لە هەمان ساڵدا واتە لە ساڵی ١٢٣٠دا شێخولیسلامی لە شێخ مەحموود شێخولئیسلام گیریا و بە مەلاحسێنی کاتبی شێخ مەحموود و مەلاعەباس درا.

لە هەمان ساڵدا کە شێخ قەسیم کۆچی دوایی کردووە، مەولانا خالید نزیکی ۴۳ ساڵ تەمەنی بووە و ناوبانگی زۆری هەبووە و لە بەغدا ژیانی دەبردەسەر.

حکومەتی سولەیمانی بە دەس سولەیمان پاشای بابان بووە. لە هەمان

ساڵدا شێخ مەعرووفی بەرزنجیش کە لە سولەیمانی دەژیا و لەوپەڕی رێز و شکۆدا بوو، پیرەمێردێکی حەفتا ساڵە بوو و کاك ئەحمەدی کوڕی دوانزە ساڵە بوو. مەلا ئەحمەدی نۆدشی باوەگەورەی عەللامە حاجی مامۆستا مەلا ئەحمەدیش لە سولەیمانی دەژیا.

لەو دەمەی کە مەستوورەی ئەردەڵان ساڵانی منداڵی خۆی تێدەپەڕاند، زانایانی زۆر لە دەوروبەر و شوێنەکانی سنەدا دەژیان. لە بەر ئەمە کە سنە دارولئیالە بوو و عالمانێکی زۆر لەوێ بوونە، لە هەموو لایەکەوە بەرەو ئەوێ دەهاتن.

خاتوو مەستوورە لە ساڵی ١٢٢٠ لە ویلایەتی ئەردەڵان و لە شاری سنە لە دایك بوو و لە ساڵی ١٢٦٤ مانگی، کۆچی دوایی کردووە. لەو ساڵەی کە مەستوورە هاتووەتە دنیا، لە سنە ئامانوڵڵاخان حکومەتی دەکرد و تا ساڵی ١٢٤٠ واتە تا کاتێ لە دنیا دەرچوو بەردەوام بوو کە لەم ساڵەدا، خوسرەوخانی ناکام لەجێی باوکی دانیشت و تا ساڵی ١٢٥٠ کە بە نەخۆشینی تاعوون تیاچوو حکومەتی کرد، خوسرەوخان چوار ساڵ دوای لەوە کە گەیشت بە حکومەت، واتە لە ساڵی ١٢٤٤دا خاتوومەستوورەی مارە کرد. کە خاتوومەستوورە لەو کاتەدا هاوسەری دووهەمی خوسرەوخان بووە. هاوسەرێك کە تەنها ٦ ساڵ لە تەك مێردەکەی ژیا.

***

ساڵی لەدایکبوونی مەستوورە هاوکات بووە لەگەڵ شەڕەکانی ویلایەتی ئەردەڵان و ویلایەتی باباندا. لەو زەمانەدا عەبدوڕەحمان پاشای بابان لە لای

ئامانوڵلاخان بووە. خالیدپاشایش لە سولەیمانی بوو. لە کۆیە و حەریریش سولەیمان پاشا حکوومەتی دەکرد. شەڕی ساڵی ١٢٢١ نێوان ئامانوڵلاخان و عەبدوڕەحمانپاشا لە لایەك و خالیدپاشا و سلێمانپاشا لە لایکیتر و بە یەك گەیشتنی سەخت و دشواری ئەو دوو سوپایە لە دەشتی مەریوان کاتێك ڕووی دا کە مەستوورەخانم لە یەکساڵ زیاتر تەمەنی نەبوو. هەر ئەو ساڵەی کە مەولەوی کورد هاتە دنیا.

لە بارەی ئەو حکومەتانە کە هاوکات لەگەڵ ژیانی مەستوورەخانم لە کوردستان بوون و باسمان لێکرد، دەبێ مێژوونوسان لە سەری بچن. بەڵام لە بارەی زانایانی هاوسەردەم لەگەڵ مەستوورەدا بە کورتی چەند باسێك دەخەینە بەرچاو.

کاتێ لە سنە مەستوورە لەدایك بوو، حوجرەی مزگەوتەکان ئاوەدان بووە لە هەموو جێگەیێك بۆ خوێندنی دەرسە ئایینیەکان بۆ سنە دەهاتن. لە چەندین مزگەوتدا زانایانی بەناوبانگ و گەورە بە کاری دەرس و فتوا وتنەوە خەریك بوون. یەکێ لەو مزگەوتانە، مزگەوتی ڕەشی قەڵابەیگی بووە کە شێخ قەسیمی عەللامە لەوێدا بووە. هەر ئەو مزگەوتەی کە مەولانا خالید هەر لەو ساڵانەدا لەوێدا دەرسی خوێندووە. و چەند ساڵێك دوای ئەوە کە لە سەفەری خۆی بۆ هیندوستان گەڕایەوە چەند حەفتەیەکی لەوێ خایاند.

***

لە ساڵی ١٢٢٠ مانگی شێخ قەسیم ٧٧ ساڵ تەمەنی بووە و لە بەین خەلکدا ڕێزیکی زۆری هەبوو.

ساڵانێکی زۆری بە دەرس خوێندن لای باوکی واتە شێخ ئەحمەدی دووهەم و مامەی واتە شێخ موحەممەد وەسیم بەسەر بردبوو دواییش بەرەو عێراق و شام ڕۆیشتووە. ساڵانی دەرس خوێندن و خوێندکاری ئەو لە دەمەشق لە لای زانایانی بەناوبانگ و گەورەی ئەوێ، وەکو شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ عوبەیدی عەتار کە لەو کاتەدا بەناوبانگترین زانای جیهانی ئیسلام لە مەزهەبی شافیعیدا بووە، بۆ شێخ قەسیم کە خۆیشی لە بنەماڵەیێکی زانستی بوو بیرەوەرییێکی زۆری بەجێهێشتبوو. ئەڵبەت شێخ قەسیم یەکەمین کەسێك نەبوو کە بۆ بەدەستهێنانی زانین و زانیاری بەرەو شام و میسر و عەرەبستان سەفەری دەکرد، کە ئەم شێوە نەریتە لە نێو قوتابیاندا لە کوردستان ڕەسم و باو بووە و تا چەندین ساڵیش دوای ئەوە هەر بەردەوام بووە. باوەگەورەی چوارەمی ئەو واتە شێخ مستەفای تەختەویش لە شام و عەرەبستان دەرسی خوێندووە. ساڵی لەدایکبوونی مەستوورە هاوکات بوو لەگەڵ لەدنیادەرچوونی زانایایەکی بەناوبانگیتر کە لە مێژووی ئیسلامدا نموونەی کەم بووە. عەللامە مەلاعەبدوللای بیتووشی کە لە ئەحسائی عەرەبستان لە دنیا دەرچووە. بەڵام لە جیاتی ئەو، هەر لە هەمان ساڵدا زانایەکی گەورەیتر پێی نایە دنیای ئیسلامەوە کە ناوبانگێکی زۆرتری بە دەست هێنا. ئەویش سەی عەبدوڕەحیم لە سەرشاتە بوو کە دواتر بە ناوی مەولەوی ناسراوە.

هەر لەو ساڵانەدا براکەی شێخ قەسیم، واتە شێخ سەعید لە سنە دەژیا. ئەگەرچی بە پلەیکی بەرز لە زانست گەیشتبوو و خەڵکی زۆر ڕێزیان لێ دەنا، بەڵام وەك براکەی ناوبانگی دەرنەکرد.

بەڵام کوڕەکانی زۆرتر ناویان دەرخست و توانیان وەك شێخ قەسیم بگرە زۆرتریش لە مێژوودا بەناوبانگ بن. کە لە هەموویان گەورەتر و بەناوبانگتر شێخ عەبدولقادری موهاجر بووە کە ٩ ساڵ لە مەستوورە گەورەتر بوو.

***

زانای گەورەی جیهانی ئیسلام عەللامە شێخ عەبدولقادری موهاجر کە لە سەردەمی لەدنیادەرچوونی مەستوورەدا بگرە گەورەترین زانای نە تەنها شاری سنە بەڵکو تەواوی کوردەواری بووبێ؛ لە ساڵی ١٢١١دا لە سنە لەدایکبوو و لە ساڵی ١٣٠٥ لە سولەیمانی لە دنیا دەرچووە. شێخ عەبدولقادر لە ساڵی ١٢٣٦دا دەسی کردووە بە دەرس وتنەوە لە مزگەوتی دارولئیحسان کە لەو ساڵە باوکی واتە شێخ موحەممەد سەعید و مامی کە شێخ قەسیمە لە دنیا دەرچوون. ئەو توانی بە باشترین شێوە ئەم جێگە و پلە زانستییە بپارێزێت. بەڵام لە ساڵی ١٢٧٠ بە تێکچوون و خراپی وەزعی سنە و پێش هاتنی فتینەیەك کە لە مێژوودا بە (الفتنە المذهبیە) ناو براوە سنەی بەجێهێشتووە و ڕۆیشتووە بۆ سلێمانی. زانایانی سلێمانی کە ناوی ئەویان بیستبوو و زۆریشیان بۆ دەرس خوێندن لەوەو پێش هاتبوونە سنە و لەلای باب و مام و باپیری ئەو دەرسیان خوێندبوو، پێشوازیەکی زۆریان لێکرد. حاکمی ئەو وەختەی سلێمانی هەواڵی هاتنی شێخ عەبدولقادری بۆ سلێمانی گەیاندە سوڵتانی عوسمانی. بەرگێکیش لە کتێبی نووسراوەی شێخ عەبدولقادر بە ناوی (تقریب المرام في شرح تهذیب الکلام)ی لەگەڵ ئەو هەواڵە ناردی بۆ سوڵتان. سوڵتان لە وڵامدا

نووسی که زۆر بەم هاتنە ڕازی و کەیفخۆش بووە[١]. لە خەزانەی دەوڵەت مانگانەیێکیشی بۆ دەربڕی. شێخ عەبدولقادر بەڕێز و ئیحترامێکی زۆرەوە تا ساڵی ١٣٠٥ لەوێ ژیاوە و گۆڕەکەی لە گۆڕستانی (سەیوان)ی شاری سلێمانیە.

لە هەمان ساڵدا واتە لە ساڵی ١٢٢٠ زانایەکی بەناوبانگێکیتر لە سنە هەبوو کە حاکمی کاتیش بەرگری لێ دەکرد. ئەویش مەلا موحەممەد مەهدی شێخولیسلام بوو کە نزیکی ٤٥ ساڵ تەمەنی بوو. مەقامێ شێخولیسلامی سنە بە شێوەیەکی میراتی بەو گەیشتبوو.

لە هەمان ساڵدا شێخ جەمالەدینی دووهەمی مەردۆخی سنەندەجی کە بە یەکێ لە زانایانی گەورەی ناوچەکە دەزانرا، لە سنە نیشتەجێ بووە و ٣٨ ساڵ تەمەنی بووە.

جگە لە شار، لە دەوروبەری سنە، چەند زانایەك هەر لەو دەمە ژیاون کە تەنانەت یاد و نێویشیان نە لەم کورتەباسە جێگە دەبێتەو و نە ئێمەش دەمانەوێ یان دەتوانیـن هەموویان بنووسین. بەڵام بە هیچ جۆرێ نابێ یادی دوو زانا لەو زانا پایەبەرزانە لە یاد کەین.

***

لە ناوچەی باشووری خۆرئاوای سنە چەند دێیەك هەبووە کە لە مێژەوە

---

١- دەقی نامەی سوڵتان عەبدولحەمید ئەمەیە کە خوالێخۆشبوو مامۆستا هەژار لە کتێبی مێژووی ئەردەلاندا لاپەڕەی ٢٧٥ کردوویە بە کوردی:

﴿دوای سڵاو، لە نووسراوەکانتەوە هونەرمەندیت ئاشکرایە، پێوقەدەمت خێر بوو، چونکە دەگەڵ هاتنی تۆ ئێمەش (سیولستوپول)مان گرت. ئەوا مانگانەیەکمم بۆ دیاری کردی، ئەگەر بەش ناکا دوای شەڕ پێیەم خەبەر دەمەوێ ئاسوودە بیت. دوعای بە خێرم بۆ بکە﴾

جێگەی زۆری لە پیاوە زانایان و عارفان (ئەهلی دڵ) بوون. یەکێ لەم دێهاتانە کە لە دێی تەختەیش دوور نییە، ئاوایی کاشتەرە کە لە پێشیش ئاماژەمان پێکرد و وتمان شێخ ئەبوبەکری کوڕی شێخ مستەفا بوو ئەوی چوو و لەوێ نیشتەجێ بوو. ئەگەر لە هەمان ساڵی ١٢٢٠ لە سنە شێخ موحەممەد سەعید و کوڕەکانی نیشتەجێ بوون لە هەمان ساڵدا لە دێ کاشتەریش، عەبدولغەفووری کاشتەری لێ بووە کە لە دوایدا دەبێتە یەکێ لە نیشتەجێیانی (خلفا) مەولانا خالید. وادەردەکەوێ لەو ساڵەی کە خاتوومەستوورە لەدایك بووە ئەم زانا پایەبەرزە، تەمەنی لە ٣٥ دا بووبێت.

***

یەکێکیتر لە زانا گەورەکانی ناوچەکە کە لەو ساڵانەدا لە سەردەمی منداڵیدا بووە و دواتر زانایەکی گەورەی لێ دەرهات و تەنانەت زانایانی گەورەی سنە هەر کاتێ گرفتێکی تایبەتیان لە بواری زانستە عەرەبیەکان وەکو سەرف و نەحو و بەلاغە و مەعانی و شیعری عەرەبدا هەبوای ڕوویان لێ دەکرد، عەللامە مەلاعەبدوڵڵای تایی بووە کە لە دێی تای لە باشووری خۆراوای سنە نیشتەجێ بووە. ئەم زانا گەورەیە کە لە ١٢٩٠ی مانگیدا لە دنیا دەرچووە، زۆرترینی شیعرەکانی شاعیرانی عەرەبی لەبەر بووە و تەنانەت هەندێکیانیشی شەرح کردووە. زۆرێ لە گەورەپیاوانەی بەناوبانگی ئەم دواییەی سنە، تا ئەم چەند ساڵەی پێشوویش نوسخەیەکی دەست نووسی یەکێ لە دیوانە عەرەبیەکانی نووسراوەی دەستی شێخ عەبدوڵڵای تاییان لەلا بووە وەك: مەقاماتی حەریری و شەرحی هیدایەی قازی حەسەنی مەیبۆدی و خۆلاسەتولحیسابی شێخ عامیلی

کە هەموویانی بە ڕاشە و لێکدانەوە و پەراوێزی خۆی ڕازاندبووەوە. مەلا عەبدوڵلای تایی زۆرترینی شیعرەکانی دیوانی موتەنەبی و بۆحتۆری و ئەبوونواس و غەریری ئەوانیشی لە بەر بووە. مەلا عەبدوڵلای تایی هەمیشە گۆشەنشین و کەنارەگیر بووە و تا کۆتایی تەمەنی دوور لە دەنگ و ناو بە سەری برد. لە بەر ئەمەش کە زۆر کەس نەیناسیوە و خۆیشی حەزی لە دەنگ و ناو نەبووە، بە داخەوە شتێ لە دەرس خوێندن و مامۆستاکان و سەفەرە زانستیەکانییەوە نازانین.

***

لە ساڵی ١٢٢٠ لە سلێمانیش زانای زۆر هەبوون. کە لە هەموویان بەناوبانگتر (رئیس العلما)ی ئەوێ بووە واتە شێخ مەعروفی نەودێ کە چەند ساڵێك بوو هاتبووە سلێمانی و پێش ئەوە لە قەڵاچوالان بووە. لەو سەردەمەدا شێخ مەعروف کە ناستی فتوادان و ئیجتیهادی لە ناوچەی بابان بوو و فەرمان بە دەستانی بابان ڕێزێکی زۆریان لێ دەگرت، تەمەنی لە ٥٤ ساڵ تێپەڕ بوو. هەروەها کە لە بواری شەریعەتدا ڕابەری ناوچەکە بوو، لە تەریقەتی قادریەشدا - کە لەو کاتەدا گرنگترین تەریقەتێك بوو کە لە نێو خەڵکدا باو بوو- وەکو ڕەهبەری تەریقەت ناسراو بوو. پێمان وایە کە شێخ مەعروف چەند جارێ هاتووەتە سنە. بەڵام بە بێ سێ و دوو لەگەڵ زانایانی گەورەی ئەوێدا پەیوەندییەکی زۆری هەبووە. تەنانەت لە ساڵی ١٢٢٨، کە ئامانوڵلاخان مزگەوتی دارولئیحسانی دروست کرد و شاعیرە بەناوبانگەکانی ئەسفەهانی بانگ کرد کە بە بۆنەی تەواوبوونی مزگەوتەکەوە شیعرێ بخوێنن، هیچکامیان

نەیانتوانی وەکو زانایانی ناوچەکە بە جوانی شیعر بخوێننەوە. کە لە بواری فارسیدا خورپەمی سەنەندەجی و لە بواری عەرەبیشدا باشترین شیعر هی شێخ مەعرووف بووە. ئەو شیعرەی کە شێخ مەعرووف بە بۆنەی دارولئیحسان هۆنیویەتەوە ئێستاش لە هەیوانی شەرقی دارولئیحسانە و بە جوانی دیارە. جا ئەوەی کە شێخ مەعرووف خۆی بۆ ئەم ڕێوڕەسمە بۆ سنە هاتبێ یا نە، زۆر ڕوون نەبووەتەوە. شێخ مەعرووف بە بێگومان یەکێ لە گەورەترین زانایانی ئیسلامی لە کوردستاندا بووە و کتێبەکانی لە بواری جۆراوجۆردا بەلگەیە لەسەر فراوانی زانیاریەکانی. لە زەوق و وێژی عەرەبیشدا تەخمیسەکانی بە سەر (بانت سعاد) و (لامیة العجم) و (بردەی بوصیری) زۆر بەناوبانگە و بێگومان بە یەکێ لە جوانترین تەخمیسەکانی ئەدەبی عەرەبی دەژمێردرێن. شێخ مەعرووف لە وێژەی فارسیشدا شارەزا بووە و چەند کتێبێکی فارسی بە شێوەی پەخشان هەیە. جارجاریش شیعری فارسی هۆنیوەتەوە.

***

لەو کاتەدا یەکێ لەو فەقێیانەی کە لە حوجرەکانی سلێمانی دەرسی دەخوێند، موحەممەدی زەهاوی بووە بە شانزدە ساڵ تەمەنەوە کە دواتر بە ناوی موفتیزەهاوی بەناوبانگ بووە.

زانایەکی گەورەیتر کە لە سلێمانیدا بووە مەلاعەبدولڵای ڕەش بووە کە لە ساڵی ١٢٢٠ی مانگی، لە مزگەوتی سەی حەسەن لە سلێمانی بە دەرس وتنەوەی فەقێیانەوە خەریك بووە. لە هەمان ساڵدا لە سلێمانی زانایەکیتر هاتووەتە دنیا بە نێوی ئەحمەد کە دواتر بە نێوی مەلا ئەحمەدی چاومار

ناسراوە. ئەم مەلا ئەحمەدە لە ساڵی ١٢٥٤دا کە عەللامە شێخ مەعرووفی بەرزەنجی لە سلێمانی لە دنیا دەرچوو، لە تەمەنی ٣٤ ساڵیدا بوو بە موفتی سلێمانی و تا کۆتایی تەمەنی لەم ئاستەدا مایەوە، دوای ئەویش کوڕەکان و نەتەوەکانی تا چەندین ساڵ ئەم مەقامەیان بە دەس بوو.

لە ساڵی ١٢٢٠دا کە خاتوو مەستوورە چاوی بە دنیا هەڵهێناوە لە ناوچەی هەورامانی ئێراندا لە نۆدشە زانایەکی‌تر ژیانی دەبردە سەر کە ٣٠ ساڵ تەمەنی بووە. واتە مەلاعەبدورڕەحمانی نۆدشی کوڕی مەلا ئەحمەددی نۆدشی یەکەم و باوکی حاجی مامۆستا مەلا ئەحمەدی نۆدشی.

هەر لەم ساڵانەدا بوو کە مەلا ئەحمەدی نولفەتی سەنەندەجی کە لە بنەماڵەی شێخولیسلامیەکان بووە لە سنە هاتووەتە دنیا، و لە ساڵی ١٢٤٠دا پلەی شێخولیسلامی وەرگرت. نولفەت نە تەنها شاعیرێکی شارەزا بوو کە لە بەناوبانگترین قازیان و زانایانی شار بوو. کەواتە لەو کاتەدا کە مەستوورە شووی کردووە و یا هەر ئەو کاتەش لە سنەوە بەرەو سلێمانی ڕۆیشتووە هەر ئەم نولفەتە شێخولیسلامی ناوچەکە بووە.

لە ساڵی ١٢٢٧دا کاتێك مەستوورە حەوت ساڵە بووە، لە دێی دشە کە یەکێکە لە دێیەکانی جوانڕۆ لە دوو فەرسەخی پاوەدا، مەلا مەحموودی کوڕی مەلامحەممەد لەدایکبووە. مەلامەحموود دوای چەند ساڵ بۆ فەقێیەتی بۆ سنە کە لەو سەردەمەدا مەڵبەندێکی گەورەی زانستی بووە، هاتووە و لە مزگەوتی (امین‌الایالە) لە لای مەلا فەتحوڵڵای دویسەیی بە دەرس خوێندن خەریك بووە لەوانەیە نزیك ساڵی ١٢٤٥ بوو‌بێت، ئەڵبەتە بۆ خوێندن

ماوەیەکیش بەرەو کاشغەر ڕۆیشتووە و بەڵام دووبارە بەرەو سنە هاتووە و سەرئەنجام گەڕاوەتەوە بۆ دشە.

مەلا مەحموود لە ساڵی ١٢٨١ لە تەمەنی ٥٤ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. بەڵام کوڕەکانی هاتن بۆ سنە و ناستی فتوادانیان لە سنە پێ سپێردرا و تا ئەم چەند ساڵەی ڕابوردوش لە زانایانی گەورەی سنە بوون.

ئەو کاتە کە مەستوورە کچێکی گەنج و زیرەك بوو، واتە لە دەوروبەری ساڵی ١٢٣٦دا کە بە دەرس خوێندن و بە دەست هێنانی زانیاری و زانستەوە خەریك بووە، شێخ قەسیمی تەختەوی لە تەمەنی ٩٣ ساڵیدا و برایەکی‌تری کە شێخ موحەممەد سەعیدە لە تەمەنی ٨٤ ساڵیدا کۆچی دوایان کرد.

***

لە دنیادەرچوونی ئەم دوو زانا گەورەیە لە سنە هاوکات بووە لەگەڵ کۆچی هەمیشەیی مەولانا خالید لە ناوچەی کوردستانەوە و سەفەرکردنی بەرەو بەغدا و دوای ئەوە لە ساڵی ١٢٣٨دا بەرەو دیمەشق دەڕوات مەولانا خالید چوار ساڵ دوای ئەوە لە ١٢٤٢دا واتە دوو ساڵ پێش ئەوەی مەستوورە شوو بکات بە خوسرەوخان لە دیمەشق کۆچی دوایی کردووە. ئەگەرچی مەولانا لە کاتی مردنیدا تەمەنێکی زۆری نەبوو، بەڵام زۆر بەناوبانگ و بە دەسەڵات بوو. ئەو لە کاتی لە دنیادەرچوونیدا تەمەنی ٤٩ ساڵ بوو.

مەولانا زۆری پێ خۆش بوو لە کوردستان بمێنێ. چەند جار بە بێ‌مەیلی ئەوی بەجێ‌هێشت، بەڵام دووبارە دەگەڕایەوە تا ئەوە کە بۆ هەمیشە ئەوێ بەجێ‌هێشت و بەرەو دیمەشق وەڕێ کەوت. داستانی پێشوازی زانایانی گەورەی

دمەشق و داستانی بە خاك سپاردنی ئەو كە خەڵكێكی زۆر بەشداریان لێكردبوو ساڵەها لە یاد و بیری خەڵكی دمەشقدا مابوو. شاعیران و عارفان و زانایانی زۆر بۆ خزمەتی چوونە دمەشق یان لە شیوەنی بە خاك سپاردنی ئەودا شیعریان وتوە كە زۆرتری ئەو شیعرانە ئێستاش هەر لەبەردەستدایە. ئەوەی كە دەیبینین نە تەنها گەورەزانایانی دمەشق بەڵكو تەنانەت زانایانی بەناوبانگی بەغدا و ئاستانەیش لەو بیرونەندێشەی ئەو پێشوازییان كردووە، بەڵگەی بەرزی و گەورەیی ئەم پیاوە نیشان دەدات. كاتێك كە سی و سێ ساڵ لە تەمەنی تێپەڕ ببو و لە مزگەوتی ڕەشی قەڵابەیگی تەریقەتی خۆی بە خزمەتی مامۆستای هەشتا ساڵەی شێخ قەسیم ناساند ئەویش پێشوازی لێكرد و كاتێك كە ئیبنوعابدینی حەنەفی كە موفتی گەورەی عوسمانی بوو لە ئاستانە یاد و باسی ئەوی بیست، پێشوازی لێكرد و لە دمەشق هاتە خزمەتی و كتێب و شێعری زۆری لە بواری لایەنگیری ئەم عارفە گەورەیەدا نووسی. تەنانەت پێش ئەوەی بەرەو دمەشق بڕوا زانای بەناوبانگی بەغدا عەللامە شەهابودینی ئالووسی نووسەری تەفسیری بەناوبانگی (روح‌المعانی)، لە خۆشەویستی ئەودا سۆزی دەربڕیوە، و دەست بە پەسن و مەدحی ئەو پیاوە گەورەیە كردووە و قەسیدەیەكی چەند سەد بەیتی لە بارەی مەولاناوە نووسیوە.

***

بێگومان لەو ساڵانەدا كە مەستوورە لە سنە گەنجێكی بیست ساڵە بووە گەورەترین ڕووداو و گۆڕانكاری عیرفانی و مەعنەوی ناوچەكە، كە لە سەر زانایانی ئاینیش كاریگەر بوو بڵاو بوونەوە تەریقەتی مەولانا خالید بوو.

مەستوورە هیچ کاتێك مەولانای نەدیبوو بەڵام لەگەڵ کەسێك ناشنا بوو و تەفسیری گرت کە زیاترین بەشی لە تەریقەتی ناوچەی سنە و هەورامان و بگرە شارەزووریش دانابێ. شێخ عوسمانی تەوێڵەیی. شێخ عوسمان تەنها دوو ساڵ لە مەولانا خالید جوانتر بوو بەڵام بەناوبانگترین جێنشینی (خەلیفە) ئەو لە کوردستاندا بوو. شێخ عوسمانی سیراجەددینی لە ساڵی ١٢٣٨دا دوای ئەوەی مەولانا خالید کوردستانی بەجێهێشت ئەویش سلێمانی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ تەوێڵە بۆ پەروەردەکردنی موریدان. ئەو خانەقا و مەدرەسە ئایینیە کە شێخ عوسمان لە تەوێڵەی دانا، زۆر کاری کردە سەر ڕەواجی دینداری و تەسەووف و زانستی ئایینی لە نێو خەڵکەکەدا. تەنانەت لە ساڵانی داهاتوودا کە دوای کۆچی دوایی شێخ عوسمان، شێخ عومەری کوڕی ئەم خانەقا و مەدرەسەیە بردە بیارە، ئەویش لە بواری زانستە ئیسلامیەکان بگرە لە تەوێڵەش زۆر بەهرەی بوویێ. گەورە پیاوانێ وەك مەولەوی و نالی و مەحوی و هەتا وەکو مەلا عبدالکریمی مودەڕڕیس هەر لەم مەڵبەندانەدا پەروەردە کراون.

زۆرێ لە زانایان زێد و مەڵبەندی خۆیان بەجێهێشت و بە مەبەستی بەدەستهێنانی تەریقەت بەرەو تەوێڵە و بیارە چوون. شێوازی شێخ عوسمانە نە تەنها کاری کردوە سەر زانایانی سەردەمی خۆی بەڵکو کاری زۆرتریشی کردووە سەر خەڵکە بێسەوادەکە. یەکێ لەوانەی کە دڵ و هەستی گراوی شێخ عوسمان بوو، کابرایەکی ملهوڕ و لات لە سنە بوو بە نێو شوکروڵڵا دواتر بە ناوی شێخ شوکروڵڵای شەعبازی سەنەندەجی بەناوبانگ بووە. پیاوێکی عارف و دڵگەرم کە لەمەو پاش لە نێو خەڵکەکە زۆر جێگەی ڕێز و ئیحترام بووە.

کۆمەڵێك لە زانایان و گەورە پیاوانی سنە کە توانیویانە بەڵگەی جێنشینی (خلافت) لە شێخ عوسمان وە دەس بێنن بریتین لە: مەلا مەحموودی دشەیی باوکی مەلاعەبدوڵلای موفتی سنە، سەی شەهابوددینی تالشی -کە لەو کاتەدا نیشتە جێی سنە بووە- و سەی عەبدوڕەحیمی مەولەوی، شێخ شوکرڵلای سەنەندەجی و شێخ موحەممەد باقری سەنەندەجی و مەلامەحموودی سەنەندەجی. و یەکێك لە نێرادەتمەندان و موریدانی بەناوبانگی شێخ عوسمان لە سنەدا ڕەزاقولیخان حاکمی ئەو کاتەی سنە بووە. و هەروەها سەی عەبدولحەکیمی گەوتەرو کە پێش لەمە بۆ خۆی، لە خزمەتی مەولانا خالید بوو بەس تەریقەتی تەواو نەکرد. گەڕایەوە لای دۆستی پێشینی خۆی شێخ عوسمان و لەوێ تەواوی کرد. ئەم زاتە پایەبەرزە کە زۆرتر لە دێهاتی گەوتەرو سەر بە ساراڵ لە باکووری سنە ژیاوە، جارجار بۆ سنە هاتووە و ئەعیان و زانایانی سنە ڕێزی زۆریان لێ گرتووە. لەو کاتە لە تەوێڵە بووە پەیوەندییەکی ڕۆحی لەگەڵ مەولەوی بەستووە و تا دوایندا دۆستێکی زۆری بووە.

هەروەها شێخ حەسەنی هەزارکانیان کە ماوەیێکی زۆر لە تەوێڵێ بووە و لەو ساڵانەی دواتری عومری گەڕاوەتەوە بۆ هەزارکانیان و لەوێ ژیاوە. دۆستایەتییێکی زۆری لەگەڵ مەولەوی بووە و زۆر جاریش لە تەك گەورەپیاوانی سنە نامشۆی بووە و ئەوانیش ڕێزی زۆریان لێ گرتووە.

سەبارەت بە شێخ عوسمان دەتوانین زیاتر لەمانە باس کەین، بەڵام لەبەر ڕەچاوکردنی شێوەی کورتە نووسین بەم کورتە ڕەزا دەدەین. خوا بیکا لە جێگەیێکی باشتر و بیشتر باسی لێ کەین.

له دواسالی لەدنیادەرچوونی خوسرەوخانی ناکام کە خاتوومەستوورە خانم کەوت (١٢٥١) مەلا لوتفوللای شێخولیسلام لە سنە لە دایك بوو.

لە ساڵی ١٢٥٤ی مانگیدا زانای گەورە شێخ مەعرووفی بەرزنجی لە دنیا دەرچوو و مەلائەحمەدی چاومار وەکو (رئیس العلما)ی سلێمانی هەڵبژێردرا، دوو ساڵ دوای ئەوە، واتە لە ساڵی ١٢٥٦دا، مەلا عەبدوڕەحمانی نودشی، سنەی بە مەبەستی سلێمانی بەجێهێشت. وا مەشهوورە کە مەلاعەبدوڕەحمان، بە ڕاوێژی شێخ عوسمان چووە بۆ سلێمانی. لە دیدارێکدا کە شێخ عوسمان لەگەڵ کوڕەکەی ئەو واتە مەلائەحمەدی نوشی بوویەتی بەوی وتووە کە بە باوکت بڵێ سنە بەجێ بهێڵی و بێ بۆ سلێمانی. لە سلێمانی لەگەڵ پێشوازی پارێزگاری ئەوێدا ڕووبەڕوو دەبێ و تا کۆتایی تەمەنی لە مزگەوتی مەلکەندی بە تەدریس و فتوادانەوە خەریك دەبێ. مەلاعەبدوڕەحمان کە لەو کاتەدا زیاتر لە ٥٠ ساڵ تەمەنی بووە.

لە ساڵی ١٢٦٢دا برای مەستوورە ئەبولموحەممەد لە دنیا دەرچووە. لەم ساڵەدا مەلاعەباس شێخولیسلام کە لە زانا ناسراوەکانی بنەماڵەی مەوالی بوو، لە دنیا دەرچوو. ئەم زاتە دەورێکی زۆری بووە لە ناوچەکەدا و بەرپرسی خەڵك و حکومەت بووە. هەر لەم ساڵەدا شێخ عومەری کوڕی شێخ عوسمان لە تەوێڵە هاتووەتە دنیا و ئەم نامیلکەی خاتوو مەستوورەشە دەبێ هەر لەم ساڵانە نووسرا بێ.

ساڵی دوای ئەوە مەلاوڕەحمانی نۆدشی لە سلێمانی کۆچی دوایی کرد. لە دواساڵدا حاجی مامۆستا مەلائەحمەدی نۆدشی بە دەعوەتی گەورە پیاوانی سنە

دێ بۆ سنه و تا کۆتایی تەمەنی، زانایان و ئەعیانی سنه بە تایبەت شەرەفولمولک کە لە ئەعیانی سنه بووە، ڕێزیان لێ گرتووە و ئەویش هەر لەوێ دەمێنێتەوە. لەو سەردەمە حاجی ماموسای نۆدشی و شێخ عەبدولقادر دوو زانای گەورەی سنه بوونن. مەلەوی چەند داستانێکی سەبارەت بە عیلم و زانستی ئەم پیاوە گەورە هێناوە کە لە یادی مەردانی خوالێخۆشبوو مەلاعەبدولکەریمی مودەڕڕیس هاتووە. لە ساڵی ١٢٦٠دا شێخ ئیماموددینی مەردۆخی باوکی شێخ موحەممەدی فەخرولعولەما ناسراو بە (حیران سنندجی) لە سنه کۆچی دوایی کردووە. لە دنیادەرچوونی ئەو هاوکات بووە لەگەڵ زۆر ڕووداوی گرنگ لە ناوچەکەدا، کە بارودۆخی زانیاری و زانایان وردەوردە ڕوو لە نالەباری دەکات. خاتوومەستوورەش لە ساڵی ١٢٦٣دا سنەی بەجێ‌هێشت و بەرەو سلێمانی وەڕێکەوت. لەو ساڵەدا هێشتا دەرس وتنەوە لە مزگەوتی دارولئیحسان لە ئەستۆی بنەماڵەی تەختەریدا بووە. گەورەترین زانایانی شار لەوێ بوون، زانای گەورە شێخ عبدالقادری موهاجیر کوڕی شێخ سەعید و برازای شێخ قەسیم لەگەڵ براکانیان لەوێ ڕێزی زۆریان هەبووە.

لە سنه زانایانێ زۆر بوون کە خزمەتیان بە خەڵک دەکرد، زۆر جار وەها بووە کە لە هەورامانەوە بەرەو ئەوێ دەهاتن، بۆ وێنە مەلا حامیدی ڕوواری لەو ساڵانەدا لە سنه بوو. ئەم مەلا حامیدە ئەگەرچی بە سەر زۆرێك لە کتێبە زانستییەکانی ئەو سەردەمەدا وەکو توحفەی ئیبنوحەجەر ئاگاداری باشی بووە، بەڵام لەبەربوونی کەسانی وەك شێخ عەبدولقادر و زانای گەورە حاجی مامۆسای نۆدشە ئەو زانایەکی لە پلەی بەرزدا بەژمار نەدەهات. خاتوومەستوورە لە بەر

چەند شتێ بە لایەوە باشتر وا بوو لەگەڵ زانایانێ وەك ئەم مەلا حامیدە -کە پیم وایە لە نەتەوەکانی مەلا خدری ڕوواری بێ- پێوەندی هەبێت تا وەکو زانایانی خاوەنی پلەوپایەی بەرز. یەکەم لە بەر ئەوەی کە لەو سەردەمەدا زیاتر زانایانی شەرعی بە سەر شاردا زاڵ بوون، و ژنێکی وەك ئەو بەو هەموو ڕۆشنبیری و ڕووناکبیژیە کە بووی بەرژەوەندی خۆی لەوەدا نەدەبینی کە لەگەڵ زانایانی گەورەدا ڕووبەڕوو بێت. دووهەمیش لە بەر ئەوە کە مەستوورەیش کارێکی بەو زانایانە نەبوو. بگرە بۆ خاتوو مەستوورەی ناسك خەیاڵی دڵ خەمین ئەمەش باشتر بێ.

سەی عەبدوڕەحیم کە نازناوی (معدومی)یە و بە (مەولەوی) ناسراوە لە ١٢٢١دا لە سەرشاتە هاتووەتە دنیا. بنچینەی بە مەلا ئەبوویەکری موسەننیفی چوڕ دەگات. لە کاتی فەقێیەتیدا کە گەنجێك بووە دێتە پاوە و دوای ئەوە دێتە سنە، بۆ ماوەیەك چوو بۆ بانە و پاشان چوو بۆ سلێمانی، بەڵام دووبارە هاتەوە بۆ سنە. وا دەردەکەوێ کە ئەم سەفەرەی دووهەمی مەولەوی بۆ سنە لە نزیکی ساڵانی ١٢٤٥دا بووە کە لەو کاتەدا مەستوورە تازە شووی کردبوو. مەولەوی بۆ جاری دووهەم هاتووەتە دارولئیحسان. ماوەیەکی زۆر لە خزمەتی شێخ موحەممەد سەعیدی تەختەویدا دەرسی خوێندووە. لەو ساڵانەدا مەولەوی و مەستوورە خانم نزیکەی ٣٠ ساڵ تەمەنیان بووە. دوای ئەوە مەولەوی چووەتەو بۆ سلێمانی و لە خزمەتی مەلاعەبدوڕەحمانی نۆدشی باوکی حاجی مامۆستای نۆدشە بڕوانامەی (اجازە) زانستی گرتووە. مەولەوی بەردەوام لەگەڵ زانایانی هاوکات و سەردەمی خۆیدا پێوەندی هەبووە. بە تایبەتی

سەبارەت بە بنەماڵەی شێخ عوسمان هەست و سۆزێکی زۆری دەربڕیوە. سەرەتا لە ساڵی ١٣٠٠ کۆچیدا کە نزیکەی سی و چوار ساڵ دوای مردنی مەستوورەیە، ئەویش لە دنیا دەرچووە. گۆڕەکەی لە گۆڕستانی (مقبرەالصحابە) لە دێی سەرشاتەیە. (بهر تاریخ وفاتش آن قدر کردیم فکر کاسمان "غش" کرد بر مرگ جناب مولوی)

مەولەوی یەکێ بووە لەو زانایانی گەورەی ئەو سەردەمە کە هەر وەکو باوەگەورەی پایەبەرزی خۆی واتە مەلا ئەبووبەکری موسەنیفی چۆڕی دەستی بۆ پێنووسی بردووە و مەبەستەکانی خۆی نووسیوەتەوە. مەولەوی لە زانستەکانی کەلام و بەلاغەدا زۆر شارەزا بووە. شیعرە کوردیەکانی ئەو بەشێکی کەم لە شیعرەکانی ئەوە کە لە ناسینی شێوە و دەسەڵاتی شیعری ئەودا نابێت تەنها ئەوانە ڕەچاو کەین.

مەولەوی دوای تەمەنی ٣٥ ساڵی لە سۆز و خۆشەویستی مەعنەویدا دەست بە داوێنی شێخ عوسمان بووە و تا کۆتایی تەمەنی سەبارەت بەو وەفادار ماوەتەوە. شێخ عوسمانیش ئەوی زۆر خۆش ویستووە و هەمیشە هەواڵی پرسیوە. بەشێ لە هۆنراوە جوانەکانیان کە بۆ یەکتریان ناردووە هێشتا ماوە و ئاماژە دەکاتە هەستە جوان و خەیاڵە ناسکەکانیان. تەئسیری شێخ عوسمان و تەریقەتی ئەو لەسەر مەولەوی لە شیعرەکانیدا زۆر ئاشکرا و ڕوونە. مەولەوی سێ کتێبی (العقیدة المرضیة) و (الفضیلة) و (الفوائح)ی بە سێ کوڕی شێخ عوسمان پێشکەش کردووە.

***

ئەگەرچی کتێبی شەرعیاتی خاتوو مەستووره لە لایەنی فیقهیەوە ناتوانێ وەکو کتێبێکی فتوا بناسرێ، بەڵام لە چەند ڕوانگەوە دەتوانین ئاماژەی پێ بکەین و لەبەرچاوی خەین. یەکێ لەوانە ئەمەیە کە ئەم کتێبە لە یەکەمین کتێبانێکە لە فیقهی شافیعیدا کە بە تایبەتی بە فارسی نووسراوە. نەڵبەت -تا ئەو جێگەی ئەمن خەبەرم بێ- یەکەمین کتیب بە زمانی فارسی لە شەرعی شافیعیدا کتیبی (المنقی) نووسراوەی (المهجردی)یە کە لە سەدەی هەشتەم لە شیراز نووسراوە و ئەمن بۆ خۆم کاری لێکدانەوەییم لە ئەستۆ بوو.

ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ئەم ئامیلکەیە لە سەرچاوە گرنگەکانی شەرعی زۆر بەهرەی گرتووە. نووسەری ئەم کتێبە لە سەر کتێبە سەرچاوەکان زۆر شارەزا بووە بە هاسانی توانیویە بە سەر گیروگرفتەکانی ئەم جورە کتێبە تایبەتیانە زاڵ بێت. تەنانەت لە کتێبەکانی حەنەفی و شیعەیش ئاگادری بووە و بەهرەی لێ گرتووە. نووسەری ئەم ئامیلکەیە لە باسە تایبەتیەکانی ئەو سەردەمە کە لە نێو زانایاندا باو بووە ئاگادار بووە. بە تایبەتی لە شەرعی شافیعیدا لە چەند کتێبی ﴿توحفەی﴾ ئیبنوحەجەر و کتێبی ﴿الوضوح﴾ی مەلائەبوویەکری موسەنیف و لە کتێبی ﴿النهایه﴾ ڕەمەلی سوودی گرتووە.

لە بەر ئەوە ئەم ئامیلکەیە بە تایبەتی بۆ مەسەلە شەرعیەکان نووسراوە، کەمتر ڕوانینی بووەتە سەر کتێبە کەلامیەکان و لە باسە کەلامیەکانیشی کەمتر بۆی چووە. ئەم کورتە ئاوڕدانەش لە سەر باسی کەلام لە بەر ئەوە بووە کە لە پێشەکی کتێبە فیقهیەکان وا ڕەسم بووە کە نووسەر کورتەیێکیش سەبارەت بە باوەڕ و عەقیدە باس کات. ئەگینا ئەم کتێبە کارێکی زۆری بە سەر

کەلام نەبووە.

ئەڵبەت لەو ساڵانە لە کوردەواریدا، باسی کەلام زۆر بە باو بوو. مەسەلا ئیبنولحاج بە نێوی عەلامەی کەلامی نێوی دەرخستووە. بە تایبەت بنەماڵەی ئەختەوی لە بواری کەلامدا زۆر شارەزا بوون. شێخ عەبدولقادری موهاجیریش لە بواری باوڕ و کەلام زۆر توانا و بەناوبانگ بوو و کتێبی (تقریب المرام) بەڵگەی ئەم قسەیە. بەس ئەو کتێبەی بە تایبەت لە حوجرەی فەقێیاندا لەو ساڵانە و لە دواتریش دەخوێندرا کتێبی (شرح العقائد تفتازانی) بوو.

بە لە بەرچاو کردنی بەشی یەکەمی ئەم کتێبەی مەستوورە و بە هەڵسەنگاندنی لە کەنار کتێبە کەلامیەکانی مەلەوی تاوەگوزی بە تایبەت کتێبە بە نرخەکەی ﴿القعيدة المرضية﴾ بۆمان دەردەکەوێ کە نە تەنها لە باری باوڕ و ئایین کە لە باری پێچوون و ڕەوشتی بابەتەکانیش زۆر وەکو یەك دەچن.

هەڵبەت خاتوومەستوورە لە عیلمی شەرع و کەلامدا، بە ڕاگەی یەکێکی وەکو مەولەوی ئاگا و دروستیش نییە کە ئێمە بە یەك چاو بۆ ئەم دوانە بڕوانین، کە یەکیکیان زانایێکە، کە شیعر کاری دووهەمی بووە (مەلەوی) و ئەو یەکەمیان شاعیرێکە کە لە نووسراوەکانی جگە لە شاوڕدانیکی بە سەر زانستە ئیسلامیەکان نەبووە. ئەگەرچی بە بێ سێ و دوو، کتێبەکەی لە جێگای خۆیدا ئەرج و بایەخێکی زۆری هەیە.

ئەگەرچی خاتوو مەستوورە وەکو زانایێکی ئایینی نەناسراوە، بەڵام بە بەڵگەی ئەم کتێبە بۆمان ڕوون و ئاشکرا دەبێ، کە لە بواری ئایینی و زانستە ئیسلامیەکانیش زانایی بووە و لەو بەحسانە کە زانایانی ئایینی دەیکەن دوور

نەبووە و ئەگەرچی هەلومەرجێکی زۆری لە ژیانا دیوە بەڵام، لە کەناری بیرە جوانەکانی کە لە هۆنراوەکانیا هێناویەتی، کۆمەڵگاکەی خۆی لە بیر نەبردووە و زۆر هانی داوە ئەوەی کە لە بیرومیششکی بە دروستی دەزانی، پێشکەشی خەڵکەکەی کا.

مەستوورە وەکو هەموو ژنێکی بە غیرەتی کورد، نەیهێشتووە کۆسپەکانی ژیانی لاپەڕەی بیروباوڕ، یان لاپەڕەی خەیاڵە جوانەکانی تێپەڕ کا و لە هیچ ماوەیێکا دەستی لە بیروبڕوای خۆی نەکێشاوە و توانیویەتی تا ئاخرین کاتی ژیانی بە داوێن پاکی و سەربەرزی، عومری بداتە سەر. مەستوورە ژنێکی ناسك خەیاڵ بوو و زۆر دڵی بە ژیانی خوێ خۆش بوو، بەڵام ژیان جگە لە چەند جار ئەویش زۆر بە کورتی، ناوڕێکی لێ نەدا و جگە لە ناڵەباری، هەدیەیەکی پێ نەدا. بگرە زۆرێ لە پیاوان لە کۆسپەکانی ژیاندا نە تەنها خەڵکیان لە بیر چوو بێ کە خودایشان لە بیر نەماوە، بەس ئێمە دەبینین کە ئەم شێرەژنە نە خوای لە بیر چووەتە و نە پشتی لە کۆمەڵ و خەڵکەکەی کردووە. بەڵکو لە بیری ئەوەدا بووە، کە بە بیر و بڕوا و خوداپەرەستی خەڵکەکەی یاری بدا و بە تایبەت ژنی کورد کە بە داخەوە زۆر جێماوتر بووە.

مەستوورە ژنێکی ناسك خەیاڵ بوو، بەڵام ئەم ناسك خەیاڵیە بە هۆی نائومێدی و دڵسووتان نەبوو، کە زۆر لە ژنان و پیاوانی دڵناسك لەم بابەتە بگرە بە نارەوا بچن و پێیان وابێ کە لەم کورتە ماوەی کە لە ژیانیان ماوە دەبێ بە لەزەت و کەیف خۆشی ڕایبوێرن، و پەنا دەبەنە شتانی نارەوا. بەس ئێمە دەبینین کە ئەم ژنە -کە دەبێ زۆرێ لە پیاوان چاوی لێ بروانن- خۆش ڕابواردنی بە ئەمە

نەزانیوە کە لە تەك کەسێ بە لەزەتی نەفسی ڕابوێرێ، بەڵکو دڵخۆشی مەستوورە لەمە بووە کە ببینێ ژنی کورد بە مافی خۆی گەیشتووە و خۆیشی توانیویە خزمەتێ بە خەڵکە خۆشەویستەکەی بکا.

مەستوورە زۆر بە وردی بیری لێ کردووە و زانیویە کە یەکێ لە خاڵە ناڵەبارەکانی کۆمەڵگای کورد، نەزانینی ژنانی کورد سەبارەت بە داب و ڕەسمی ئیسلام و ئایین و بڕوایە. دەبێ هەوڵ بدا کە هاوجنسی خۆی ئاگادار کا تا بڕوا بە شوێنی ئەو شتەی بە دەردی دەخوا. کە لە هەر موجتەمەعی ژنان بە سەقافە و بە ئایین بن، خۆشی و سەعادەت ڕوو دەکاتە ئەوێ و خەڵکەکەی ڕزگار دەبن. مەستوورە بە لایەوە جوان نەبوو کە دەیبینی بڕێ لە ژنان تەواو زەحمەت و هانیان بو ئەوەیە جوانتر بن و خشڵی زۆرتر بە خۆیانا کەن. کە ئەگەر خۆی گەرەکی بوای -وەکو ژنێکی دەوڵەمەند- دەیتوانی هەموو ئەو شتانەی کە زۆری لە ژنان نارەزوویانە بیانبێت، ئەو ببێت و خۆی پێ جوان کا، بە تایبەت کە ژنێکی جوانکەڵە و نەشمیلانە بووە. لە بیری مەستوورە ژن دەبێ زۆر شووی خۆی خۆشگەرەك بێ. و بە ڕاستی کە لەم بابەتە مەستوورە بێ ئەونەیە و دەبێ ژنانی کورد چاوێ لێ بڕوانن.

مەستوورە لە لای وا نییە کە ئەو ژنانەی بڕی لەم شتانە نازانن یان بە دابی ئیسلامی ژیانیان بە سەر ناوبەن، ئەوە ئیتر ئەوان کافرن و دەبێ خۆمان لە ئەوان جیا کەین. هەر لەم بابەتیشەوە دەبێ ئەو خوشك و برا خۆشەویستانە سەرنج دەن کە — هەروەها کە مەستوورە بە دروستی

دەزانی- دین دەبێ بۆ هەموو خەڵکی بێت نە گروپێکی تایبەتی کە خۆیان لە خەڵکی جیاواز دەزانن. بێگومان خودا هەموو خەڵکی خۆش دەوێ و هەموومان دەسکراوی ئەوین.

کەوابوو بە جوانی شارەزا بووین کە پێش لە زۆری لە موجتەمەعەکانیتر، کۆمەڵگای کورد ژنێکی وەکو مەستوورەی تێدا ژیاوە کە زۆر هەوڵی داوە دین و بڕوا لە موجتەمەعەکەی دامەزرێنێ. بەڵام دامەزراندنێ کە لە موجتەمەعی کوردی باوە و مەستوورەیش وەکو هەموو زانایەکی شارەزا پێ وابووە کە ئایینی ئەم خەڵکەش دەبێ لە کەناری بیروبڕوا و سەقافەی کوردی، بۆ ڕزگاری خەڵکەکە بە کار بهێنرێ.

یەکێتر لەو شتانەی کە لێرە شایانە لە سەری بچین و لە بەر چاوی خەین ئەوەیە کە، لەو سەردەمەیە کە ئەم کتێبە نووسراوە، زانایانی ئایینی بایەخێکی زۆریان لە نێو خەڵکا بووە و لە جایگایێکی بە نرخ بەهرەمەند بووگن. ئێمە دەبینین کە چلۆن دەسەڵاتداران و حاکمەکان لە عالمە ئایینیەکان هەیبەتیان دیوە و قسەی ئەوانیان لە بەرچاو کردووە. کە زۆری لەوانەمان پێشتر لە بەرچاو خست.

لە ئەنجامدا دەبێ چەند شتێ لە بەرچاو خەین.

یەکەم ئەمەیە کە هیچ کارێک بێ هەڵە و نوقسان نییە، ئەگەرچی دەرهێنەرەکەی زۆریش خۆی پێوە ماندوو کردبێ یان وەختێکی زۆری بە سەریا خایاندبێ. ئەم کاری ئێمەش لەمە جیاواز نییە. ئەگەرچی زۆرمان

هەوڵ دا شتێ بە خەڵکەکەمان پێشکەش کەین کە شایانی ڕێز و حورمەتی ئەوان بی، بەڵام ئەگەر نوقسان یان هەڵەیەك چ لە باسەکان یان لە ڕێزمانەکە ئەبینن دەبێ بمانبەخشن. بە تایبەتی کە دەرفەتی ئێمە بۆ نووسینی پێشەکی و لێکدانەوەی ئەم کتێبە زۆر کورت بووە. بەڵکو یاریدەمان بدەن بۆ جارانی دوایین شتێ باشتر پێشکەش کەین. بڕێ لە وشەکانی ئەم کتێبە لە وشەکانی بن زاراوەی سنەی واتە ئەردەڵانین.

ئەڵبەت نابێ ئەمە لە بیر بەین کە ئەم کتێبە بە یارمەتی چەند کەس نووسراوە کە هەرچەند ناویان بەرم و ڕێزیان لێ بگرم، هیچم نەکردووە و منەتیانم لەبەرچاوە.

یەکەم، دوکتۆر هادی مورادی کە لە بابەتی چوارچێوەی وتارەکە چەند نوکتەی خستە بەرچاوم. بە واتەی مامۆستا هەژار ﴿تا خوا حەز کا پیاوێکی نەرم و نیان و ئەخلاق باشە﴾

دووهەم، کاکە ماجیدی مەردوخ ڕۆحانی. زاتێکی زانا و زەحمەتکێش و هونەرمەند و دڵڕەحم بۆ هەموو کەس. هەر کەس دیویەتی خۆشی ویستووە چونکە هەر کەسی دیوە خۆشی ویستووە.

سێهەم، لەیلا دوست و خێزانی خۆشەویستم کە ئەم کتێبەی چەند جار خوێند و گوێی لێ گرت و چەند ڕەخنەی بە جێگەی نیشانم دا.

چوارەم، کاك جەماڵ ئەحمەدی‌نانیین، برادەری نازیزم کە بۆ یەکەم جار کتێبی مەستوورەی نیشانم دا و کتێبە فارسیەکەی دووبارە نووسیەوە و چەند خاڵی هەڵەشی بۆم ڕاست کردەوە و هۆزراوە

فارسیەکانیشی بۆم ناسیەوە.

پێنجەم، بەرای زۆر خۆشەویست و نوکتەبێژ کاکەعیرفان فەرشادی کە لە وەرگێڕانی چەند لاپەڕە لە پێشەکیە فارسیەکە بە کوردی منی یارمەتی دا.

هەروەها برادەری کوردیزان و دڵسۆز کاك عەدنان بەرزەنجی.

و لە ئەنجامدا بەرای ڕووخۆش و دڵنشین کاکە موحەمەدی سوڵتانیان کە زۆربەی بەشی کامپیۆتری کارەکەی گرتە ئەستۆ.

تەوید نەقشبەندی

ڕەزبەری٢٧٠٥ کوردی/ڕەمەزانی ١٤٢٦ی کۆچی مانگی

به نێوی خوای دەهەندە و دڵۆڤان

حەمد و سپاسی زۆر و بێ وێنە بۆ ئەو خودایە کە بە واتەی ئایەی «اهدنا الصّراط المستقیم» ڕێبەری زانایانی ڕێگای یەقین و ڕابەری ڕێبوارانی شەریعەتی ئایینی ئیسلامە.

خداوند دیوان روز حسیب  جهان دار دادار بالا و شیب[1]

شهنشاه رزاق روزی رسان  سر تاجداران، کس بی کسان

واتە: ئەو خوداوەندەی کە ساحێبی ڕۆژی قیامەتە و هەموو دنیا چ لە بەرزی بێ چ لە خواری هەمووی بە ئیرادەی ئەو دەگەڕێ؛ هەر ئەو خوداوەندەی کە ڕزقی هەموو کەس بە دەستی ئەوە و لە هەر پادشایێك بەرزترە و کەسی ئەو کەسانەیە کە کەسیان نیە و بێکەسن.

و هەروەها سڵاو و ڕێزی هەرمەرز و بێ وێنە و بێ تەواو بوون، لەسەر باڵای ئەو تاقە سوارە کە ڕێبوارانی قاڕی شەریعەت لە هەموری شەفاعەتی ئەو تێر

١ - ئەم دوو بەیتە هی خاتوو مەستوورەیە

ئەبن و ئەوانەی کە لە ڕێگەی تەریقەتیش بەجێماون و داماو ماونەتەوە، بە پاشماوەی ڕەحم و بەزەی ئەو دێنەوە سەر ڕێگای ڕاستی و دروستی.

محمد شه فرقه ی انبیا          شفیع گناهان به روز جزا

و هەروەها سلاو و سەلەواتی زۆر لە سەر ئەولاد و ئەتەوەکانی کە شەمعی شەبوستانی خوداوەندی ئەترس و خۆشەویستی باخی «لولاك لما خلقتُ الجنَّ و الانسَ و الافلاكَ.[1]» صَلِّ علی المصطفی و المرتضی و ازواجِهم و اولادِهم و اصحابِهم الوري.

لە دوای ئەمانەوە ئەمنی زۆر تاوانبار و بێبەهرە، کە دەست بە نووسینی ئەم کتێبەم کردووە، نێوم مەستوورەیە و دەڵێم، کە هۆی نووسینی ئەم کتێبەی «شرعیة الدلالة» ئەمە بوو کە لە ڕۆژێکدا کە گڵۆڵەی بەختم لە بێوەفایی دەوران کەوتبووە لێژی و شووشەی هەیبەتم بە بەردی نالەباری مرقەدەری ڕۆژگار شکابوو، و ڕۆژم بە وێنەی زوڵفی تازەبووکان شێوابوو و ڕۆژگارم وەکو خۆم بێسەر و سامان کەوتبوو و دڵم بە تیری خەدەنگی فەلەك خوێناوی مابوو و کۆشکی بەختم بە دەستی گەردوونی نالەبار ڕووخابوو:

نشستهٔ پریشان و خوار و ملول     همی کوکب بختم اندر افول[2]

---

[1] - ئەگەرچی ئەم ڕەوایەتە زۆر بەناوبانگە بەس بەڵگەیکی زلری لە سەر نیە و لە کتێبەکانی سحاح نەهاتووە.

[2] - ئەم بەیتە هۆنراوەی مەستوورەیە.

واتە: بە کزی و لاوازی و دڵتەنگی دانیشتبوم و سەیری هەسارەی بەختی خۆمم دەکرد کە چلۆن بەرەو خامۆشی و کووژانەوە دەڕوا.

هەر لەو سەردەمەدا بوو کە لەگەڵ چەند کەس لە خزمان و ژنانی هاودینی خۆم دانیشتبووم و قسەی خۆشمان دەکرد و لە هەر باسێکەوە بۆی دەڕۆیشتین، تا چووینە سەر باسی ئایین و شەریعەتی حەزرەتی موحەممەدی مستەفا - دروودی خوای لە سەر بێ- ئەگەرچی من بەهرەمێکی زۆرم لە زانستە ئایینیەکان نییە و لەم سەبارەتەدا خاوەن عیلمێکی زۆر نیم، و خۆمم وەکو ڕێبەرێکی ئەم ڕێگایە نەناسیوە، وەلێ جارویار لە خزمەتی ئەربابی ئەم عیلمە بووگم و لە زەریای عیلمی ئەوان چەند دڵۆپێکم نۆشیوەتەوە.

تمتع زهر گوشه ای یافته          زهر خرمنی خوشه ای یافته[1]

واتە: لە هەر کونجێك بەهرەیکم وەدەست کەوتووە و لەسەر هەر خەرمانێ چەن لقێکم چنیوە.

وەختێ بە حەقیقەت و ڕاستی گەیشتم، دیتم کە هەموویان لەو گۆڕەپانەدا بە خۆڕایی دەخولێنەوە. بە بێ سێ و دو دەستی ئارەزوو داوێنی حەز و خۆزیای گرت و لە بەحری بێ‌وێنی بیروبڕوا خنکاندمی. ساتێ بۆ خۆم قەتیس مابووم و بیرم لێ‌دەکردەوە کە بێم و هەموو ئەو شتانەی کە داب و نەریت و ئەسڵ و فەرعی ئایینی تیایە کە لە داری ئیمان جودا دەبنەوە و بڕێ لەو فەرایزە کە ڕێ‌پێشاندەری ڕێ‌لێشێواوانە و پێویستە هەموو بەندەیك بە جوانی بیزانێت، لە

---

[1] - ئەم هۆنراوە لە شاعیری پایەبەرزی ئێرانی سەعدیە کە لە دیوانەکەی ئاوا هاتووە

«تمتع ز هر گوشه‌ای یافتم          ز هر خرمنی خوشه‌ای یافتم»

نامیلکەیەکدا بینووسم و لەبەر دەستی ئەوانی بنێم. بەڵام لەبەر ئەوە کە بۆ خۆم لەم عیلمەدا بەهرەیەکی زۆرم نیە، بە یاری و هاوڕێگایەتی، عالمی زۆر زانا و دۆستی نوکتەبێژ کە لە ئاسمانی عیلم و زانستدا وەکو مانگێکی جوان ئەدرەوشێتەوە واتە مەلاحامیدی ڕواری کە لە زەریای زانیندا گەوهەرێکی نادیارە، ئەم کتێبەم تەواو کرد و نامیلکەکەم بە کۆتایی هێنا و لە سێ بەندا ڕێکم خست. واللە اعلم بالصواب

ئەم بەندە باس لە ئوسـوولى ئاييـن دەكـات. پێويـستە هـەر بەنـدەيك لـە بەندەكانى خوداى گەورە، ئەسـڵ و فەرعى ئاييـنى خـۆى بناسـێت، نـەگـينا ئيـمان دەرناوا. كەوا بوو پێويـستە هەموو موسوڵمانێ بۆ زانيـنى ئەو شتانە هـەوڵ بـدات و ئەو ئوسوڵە بزانێت. ئوسـوڵى ئاييـن لە ريژەى ئەسـڵ گيـراوەتەوە، كـە بريتيـن لە پێنج شت.

الف) زات　　　　ب) سيفات

ج) مەبدەء　　　　د) ميعاد

هـ) نوبووەت

لە دواى ئەوە كە زانيـت ئوسـوڵى ئاييـن پێنج شتـن و ئەمانـەت بـە جوانى بيست، سزايە كە لە زانينى ناوەرۆكى ئەمانـەش تێبگـۆشـى و لـە بنچـينەى ئـەم ئوسوڵە بە جوانى شارەزابى. مەسـەلا، زات واتە خـودا بـە يەكيـەتى و تاقانـەوە

دەبێ بناسرێت، کە دۆست و شەریکی نییە و بێوێنەیە. نە دەتوانی بپرسی کە چۆنە و نە دەتوانی کە بپرسی کە چەندە. نە دەتوانی بیر لەوە کەیتەوە کە خودا چۆنە وەیا بپرسی کە خودا چەند دانەیە. لە مس یا لە ئاڵتوونە، ئایا وەکو بەشەر وایە یا وەکو جەوهەرە یان، ئایا دەست و جەواریحی هەیە یا نیەتی. بۆ ئەوە کە عەقڵی هیچ بیرەوەر و عاقڵێك بە بنچینەی زاتی خودا ناگات و هەر ئەمە بەسیەتی کە خودا زاتێکە زیندوو کە واجب الوجودە.

نیزامی[1] دەڵێت:

| | |
|---|---|
| خدای بلندی و پستی تویی | ندانم چه ای هر چه هستی تویی[2] |

واتە: تۆ خودای هەوراز و نشێوی بەس بۆ خۆم نازانم ئەتۆ چیت؟ هەر شتێ هەیت تۆ بۆ خۆت وایە کە خۆت دەزانی.

ئەگەر زاتی گەورەی ئەو نەبوایە، دنیا و ئەوانەی لەوێ دەژین نەئەبوون.

جا باسی سیفاتی خودا: لە دوای باوەڕهێنان بە زاتی واحیدی ئیلاهی، پێویستە بزانین کە خودای گەورە سیفاتێکیشی هەیە و ئەم سیفاتە بریتین لە هەشت سیفەت:

| | |
|---|---|
| حی (زیندوو) | دانا (زانا) |
| بصیر (بینەر) | سمیع (بیسەر) |

---

[1] - شاعیری گەورەی ئێران کە لە قەرنی ٦ ژیاوە و ئەم کتێبانە هی ئەون. «شیرین و خسرو» «هفت پیکر» «اسکندرنامه» «لیلی و مجنون»

[2] - ئەم بەیتە لە کتێبی (شرفنامه خمسه نظامی) نیزامی ئاوا هاتووە:

| | |
|---|---|
| پناه بلندی و پستی، تویی | همه نیستند، آنچه هستی تویی |

توانا (بەهێز) گویا (وتڕا)

صاحب اراده (ئەو کەسەی ئیرادەی هەیە)

باقی (ئەوەی ئەمێنێتەوە)

یەکەمیان ئەوەیە کە خودا زیندووە، نە مردووە و نە ئەمرێ.

آنکه نمرده و نمیرد خداست و آنکه تغیّر نپذیرد خداست

واتە: ئەو کەسەی کە نەمردووە و نامرێت هەر خودایە و ئەو کەسەش کە ناڵوگۆڕ سەریا نایەت هەر خودایە و بەس.

دووهەمیان ئەوەیە کە خودا زانایە، واتە لە هەموو شتێ ئاگادارە.

سەعدی[1] وتوویە:

حاجت موری به علم غیب بداند در چه چاهی به زیر صخرهٔ صمّا.

واتە: خودا لە عیلمی غەیبەوە بە نیازی مێروولەیکیش دەزانێ ئەگەرچی ئەو مێروولەیە لە بن چاڵێ بێت کە لە ژێر تاشەبەردێکی زۆر سفت و بە قووەتا بێت.

سێهەم: (بصیر) واتە بینەر یەعنێ ئەو کەسەی کە دەتوانێ ببینێ. بەس بەم مەعنا نیە کە هەر بەم چاوە ببینێ کە ئێمەش دەبینین. بەڵکو بەو چاوە دەتوانێ لە ژێری خاکیش تەکانی پاخلیسکەی مێرولەیکیش ببینێ.

چوارەم: (سمیع) واتە بیسەر، ئەو کەسەی کە ئەبیسێ. تەنانەت خودا دەنگی

---

۱ - شاعیری گە ورەی ئێران کە لە سەدەی ۷ ژیاوە و «گلستان» و «بوستان» دو کتیبی مەشهووری ئەون

پای مێروولەیێك كە لە خۆیْ بێدەسەڵاتتــر هــیچ نیــە، دەبیــنیْ. بەس نە بەم گوێچکەیە کە ئێمە پێی ئەبیسین.

پێنجەم: خودا تەوانایە، و تەوانا یانی قادر، و قادر یــانیْ ئــەو کەســەی کــە قودرەتی هەیە. کە خودا توانای ئەوەی هەیە کە پادشایێك بێنێتە خوارەو و لەسەر خاکی ڕووتی دانیْ. هەروەها خودا توانای ئەوەیە هەیە کە دەورێشێکی بێبەشی فەقیر، بکا بە خاوەن زێرێکی بە توانا و دەوڵەمەند.

شەشەم: وێژا، واتە ئەو کەسەی کە دەتوانی قسە کات. بەڵام نـە بـەم زیانـە کە ئێمە هەمانە. قورئانی پیــرۆز لەم بابەتە شاهیدێکی ڕوون و ئاشکرایە.

حەوتەم: خودا ســاحیبی ئیرادەیە، واتە هەرچێکی بویْ دەتوانیْ بیکات. کــە دوو دنیا و ئەوانەی لە وا دەژین بــە ئیــرادەی «کُن» بــە دنیــای بــوون و وجــودی هێناوە و دەتــوانێتــیش هــەر وەهــا بــە ئیــرادەی «فیکون» هــەمووی خاتــە ســەر عالەمی ئەبوون کە لەبەینچوونی بەنی ئادەم و ئەم دنیایە نیشانەی ئەم قودرەتەیە و هەروەها ئەمە کە سوتانی پورتوکاو لە دوای هەزاران ساڵ، دەکاتەوە ئینــسان.

هەشــتەم: بەقایە واتە خودای گــەورە دەمێنێتــەوە و هــیچ وەختێ لــە کــیس ناچێت.

بە شوێن ئەمانە ئەسڵی مەبدەئە: بەم مانایە کــە خــودا ئێمــەی لــە ئــەبوون هێناوەتە دنیای بوون و خودا هەموو شتێکی لە عەدەمەوە خەلق کردووە.

ئەسڵی دوایــن، مــیعادە کە بە واتەی ئایەتی «کـلّ نفــسٍ ذائقـةُ الـموت»[١] ئێمە دەمرین و دووبارە زیندوو دەبــنەوە و ڕۆژی حەشــر و پــرد و ســرات و مــیزان

---

١ - ئالعمران/١٨٥ «هەموو کەسێ تامی مردنی دەچێژێ» (هەژار)

هەمووی دەبینین.

بە شوێن ئەمانە ئەسڵی نوبووەتە، کە ئیمان هێنانە بە پێغەمبەربوونی حەزرەتی موحەممەد -دروودی خودای لەسەر بێ- و پێویستە کە بزانین خودای گەورە لە زەمانی حەزرەتی ئادەمەوە هەتا پێغەمبەری ئێمە حەزرەتی موحەممەد(د.خ) سەدوبیست و چوار هەزار پێغەمبەری ناردووە کە ئاخرین و گەورەترینیان حەزرەتی موحەممەدە. سێسەد و زیادە لەمانە(د.خ) مورسەل بووگن و بە ئەودوایشیان دەڵێن نەبی. جیاوازی نەبی و مورسەل لەمەیە کە ئەوەیان کە کتێب و شەریعەتی نوێی بێ و بە ناردنی حەزرەتی جیبریل، کتێبی بە سەریا هەناردبێ، بە ئەوە دەڵێن ڕەسووڵ، وەلێ ئەگەر هەر ئەو کتێبەی کە بۆ پێغەمبەری پێش هاتووە بۆ ئەویش هەر ئەوە بێ و شەریعەتی تازەی نەبێ و بۆ خۆی لە سەر ڕێگای ڕەسولێکی دیکە بێ، بەوە دەڵێن نەبی. دەبێ هەر موسوڵمانێ دان بنێ بە ڕیسالەت و نوبووەتی هەموو پێغەمبەرانی خودای گەورە کە بۆ لای ئێمەی هەناردون کە وتوویانە «النبي انسان مبعوث من الحق الى الخلق» ئاخرین پێغەمبەریش بریتیە لە حەزرەتی موحەممەدی مستەفا(د.خ).

نووسەری ئەم کتێبە دەڵێ کە زانایانی شێعەی ئیمامیە لایان وایە کە ئیمان هاوردن بە ویلایەتی حەزرەتی عەلی(د.خ) لە ئوسووڵی ئایینە[1]، بەڵام زانایانی شافیعی ئەم ڕوانینە بە دروس نازانن. ئوسوڵی ئایین هەر ئەو شتانەیە کە لە پێشدا یەک بە یەک هێنامان.

---

[1] - لە کتێبە دەستنووسە فارسییەکە چەند وشەیەك لە ئەم بەشەی تێك چووبوو. بە بڕوای ئێمە ئەوەی باش نەنووسراوە دەبێ هەر ئەوەیە کە نووسراوە.

ئێستە کە ئوسوڵی ئایینت زانی، کە بریتین لە ئیمان هێنان بە خودای گەورە و ئیمان هاوردن بە پێغەمبەربوونی حەزرەتی موحەممەد[د.خ] کە بانترین پێغەمبەرە. وەختێ ئەمانەت زانی، دەبێ ئیمانمان بێ کە حەزرەتی موحەممەد[د.خ] خودا بە پێغەمبەری، هەناردوویەتی بۆ لای ئێمەی گوناکار تا ئیمان بێنین. ئەو شتانەی کە ئەو ئەمری کردووە هەمووی واجبن و لە لای خوداوە هاتوون. چونکە خوداوەند ئەوی ناردووە و ئەویش ناردەی خودایەوە حەزرەتی ڕەسول[د.خ] مورسەلی خودایە. جیاوازی کە بەینی مورسیل بە کەسرەی سین و مورسەل لە ئەمەیە کە مورسیل یانی ئەو کەسەی شتێ ئەنێرێ و مورسەل یانی ئەو کەسەیە بۆ لای کەسێکی دی ناردوویانە. بەمنا بەمە ڕوون دەبێتەوە کە حەزرەتی موحەممەد[د.خ] لە لایەنی خوداوە بۆ لای ئێمە هاتووە و دەبێ ئێمەش لە ئەنجامی ئەو شتانەی کە ئایین وتوویەتی، زۆر هەوڵ بدەین و

هەمووی بە جوانی ئەنجام بدەین.

هەروەها دەبێ بزانین کە ئایینی حەزرەتی موحەممەد(د.خ) فرووع و لقی زۆری تێدا هەیە. کە دەبێ ئەوانە ئەنجام بدەین کە بریتین لە پێنج شت:

یەکەم: نوێژە

دووهەم: ڕۆژوو

سێهەم: زەکات

چوارەم: حەج

پێنجەم: جیهاد

چوار لەمانە بە بەدەن ئەنجام دەبن و کاری بەدەنن، مەسەلا نوێژ کە بریتیە لە وێستانن (قیام) و دانیشتن (قعود) و سەجدە کردن. کەوابوو زانیمان کە نوێژ کاری بەدەنە. بە واتەی ئایەی «و اقیموا الصلاة و لا تکونوا من المشرکین»[1] هەرکەسێ نوێژ نەکا لە بارەگای خودا دەری دەکەن. هەروا کە هەر بەندەیك بە قسەی ئەربابەکەی خۆی نەکا عەزاوی دەدا. ئێمەش دەبێ بزانین کە ئەربابی هەر دوو دنیا خودایە و لە ئەمری وی نابێ دەرچین کەواتە: «و اقیموا الصلاة و آتوا الزکاة»

ڕۆژوو کە (الصوم)ە، ئەویش لەسەر بەدەنە و کاری بەدەنە چونکە تەواو ئەعزا و جەوارحی ئینسان دەبێ خۆیان لە نارەوا دوور بکەنەوە. هەروەها حەج و جیهادیش کاری بەدەنە. وەلێ زەکات کاری بەدەن نییە و کاری ماڵ و دارانیە. شەرحی هەر کام لەمانە بە تەواوی لە جێگەی خۆی دەیهێنین. انشا الله الوحده

---

١- الروم/٣١ «نوێژ بکەن و لە ڕیزی ئەوانە مەبن کە شەریکی بۆ پەیدا ئەکەن»

العزیز.

## نوێژ

بزانە کە فەرعی یەکەم لە فورووعی ئاییــن نوێــژە کــە لــە ســێ بەشــدا باســی لێدەکەین.

بەشی یەکەم: لە بابەتی پاکی و تەمیزی

بەشی دووهەم: ئەو شتانەی بۆ دەسنوێژ واجبــن و ئەو شتانەی دەســنوێژ لــە بەین دەبەن

بەشی سێهەم: باسی ئەو شتانەی لە نوێژدا واجبــن.

# بەشی یەکەم : پاکی

دەبێ ئینسان ئەوەندە خاوێن و پاك بێت کە یەقین بێنێ کە لە حەدەس (حدث) و خوبس (خبث) و پیسی پاك بوو‌تەوە. حەدەس ئەوەیە کە لە خودی ئادەمیزاد پێك هاتووە وەکو بەول (گمیز) یا غائیت (غائط) (چەپەڵی) یا بایك کە لە مەخرەجی ئینسانەوە دێتە دەرێ یان ئەو شتانەی وەکو ئەون. خوبسیش ئەوەیە کە لە ئینسانەوە نییە بەڵکو لە غەیری ئینسانەوە تووشی بنیادەم دەبێت. مەسەلا لە دەسبەئاوا یانێ موستەراح بایك هەڵکا و گمێز یا ئاوێکی پیس و نەجس بپاشێنێ یا لەشی کەسێ بە پیسی و نەجسی ببێ، هەر لەو دەمدا کە لە حەدەس و خوبس پاك بوونەوە، پاکی هاتووەتە دی. زانایان وتویانە کە لە کاتی تەهارەت واتە پاکبوونەوە و دەسبەئاو چوون دەبێ جۆرێ دابنیشێ کە نە ڕوو بە قیبلە بێ و نە پشت بە قیبلە کات.

# بەشی دووهەم:

## باسی ئەو شتانەی بۆ دەستنوێژ واجبن

## (شرایط الوضوء)

بۆ دەستنوێژ چەند تایبەتیمان دەوێ. یەکەم ئەوەیە کە دەبێ بە ئاوی پاك و خاوێن دەستنوێژ ساز کرێت. ئاوی پاك بریتیە لەو ئاوە کە پێی نەڵێن ئاوی زەعفەران یا گوڵاو یان شتی وا. دەبێ ئەو ئاوە کە دەستنوێژی پێ دەگرن خاوێن بێ و بە قەدەری قولەتەین (قلتین) بگا و قولەتەین ئەو ئاوەیە کە بە قەدەر ئەرج و چارەکێ لە درێژایی و پانایی و قووڵی بگا. ئەگەر لە کاسێکا کە مورەبەع بێ، ئاوێ برژێنن و پڕی کەن دەبێ درێژایی و پانایی و قووڵی ئەو کاسە بە قەدەری یەك زراع و چارەکە زراعێ بێت. ئەگەر ئاوەکە لە عەرزا بێ دەبێ هەر وا بێت. وەلێ ئەگەر ئاوەکە لە عەرزی نەبێت واتە لە کانی و چاوکە یا لە حەسێڵی بێت، کە درێژایی زۆرە وەلێ پانایی و قووڵیەکەی زۆر نییە، ئەتوانین ئەویش بە قولەتەین دانین. ئەگەر بمانەوێ قولەتەین بە قورسی بسەنگێنین دەبێ بە پانسەد ڕەتلی بەغدای بگا، کە هەر ڕەتلێ سەدوسی درهەمە و هەر درهەمێ پەنجاودوو حەببەیە و ئەم حەببەیە بریتیە لە دەنکە جۆێکی نە زۆر

کورت و نە زۆر درێژی باریك کە سەر و بنی جودا بێتەوە.

دروستە بە ئەو ئاوە تەهارەت یا دەسنوێژ بگیرگێ یا لەو ئاوە بخورگێتەو. ئەگەر ئەو ئاوە بە قەدەری قولەتەین ئەگا، ئیتر دەسنوێژی لێ نایەت. چونکە ئاوی دەسنوێژ دەبێ بۆ خۆی پاك بێ و بتوانێ پاکیش کاتەوە. جیاوازی لە بەینی ئاوی پاك و ئاوێ کە بتوانی پاك کاتەوە ئەمەیە کە دەتوانین گولاو یان ئاوی زەعفەران بنۆشینەوە بەڵام ناتوانین پیسی پی لابەین واتە ناتوانین شتێکی پی خاوێن کەین. خودا فەرمورویەتی: «و انزلنا من‌السماء ماء طهورا»[1] واتە: لە ئاسمانەوە ئاوی پاکمان بۆ ناردن کە بیخۆن و شتی پێ پاك کەنەوە. لەمە رۆشن دەبێتەوە کە ئاوی دەسنوێژ دەبێ پاك بێ و خۆشی توانای پاك کردنەوەی بێ. ئەگەر بنیادەم لە سەفەرێ بێ کە ئاوی دەس نەکەوێ تەیەممووم (تیمم) بە تۆزێکی پاك دروستە. کە خودا فەرموویەتی: «فتیمموا صعیدا طیبا»[2] واتە تەیەممووم کەن بە تۆزی پاکی سەر زەوی. بە جیاتی دەسنوێژ و غوسڵ. تەیوممم بەم جۆرە دەکرێ، کە کۆمەڵە تۆزێکی خاوێن بێنی و نیەت کەی بەم جۆرە کە نیەتم هەیە تەیومم بگرم لە جیاتی دەسنوێژ و برێ لە زانایان وتوویانە کە دەبێ بێژی نیەتم هەیە نوێژ لە سەر خۆم بهێنم یان موباح کەم. لە دوای ئەمانە دڵی دەستی بخاتە نێو تۆزەکە و لەو دوا مەسحی کات. یانی دەستی بهێنێ بە توێڵی لە لای ژووروی دەم و چاویەوە و لەوێ بیهێنێتە خوار تا دەگاتە چناوکی کابرا. ئەمە دەبێ بە سوکنایی و ئەهوەنی بیکا. لەو کاتەیدا کە دەستی ئەهێنێتە

---

[1] - الفرقان/٤٨ «جا ئەوسا لە ئەوایەوە بارانێکی پاك و خاوێنمان نارده خوار» (هەژار)

[2] - المائده/٦ «بە تۆزی پاکی سەرزەوی تەیەمم بکەن»

خولر، دەبێ قامکی گەورەی بخاتە بەر کونی لووتی و دوای ئەمە دووپاتی کاتەوە و دڵی دەستی بهێنێ بە سەر توزەکا لە دواینا دەستی چەپی بهێنێتە دەستی ڕاستیا و دەستی ڕاستیشی بهێنێتە دەستی چەپیا. بەم جۆرە کە یەکەم، کابرا لە پشتی دەستەوە شروع کات و دەستی لە سەری نینۆکی بهێنێتە ژووری تا ئەگاتە ئانیشکی کابرا لە دوادا دەستی بەم بارا بێنێتە خوار تا ئەگاتە سەر ئەنگوستی نێوەراس. ئەم جۆرە تەیەموم کردنە هەم بۆ دەسنوێژ و هەم بۆ غوسڵ کەفایەت دەکا.

دەسنوێژیش وا دەگیرگی کە خودا لە قورئانا فەرموویەتی: «یا أیُّهاالذینَ آمنوا اذا قُمتُم الی الصَّلوة فاغسِلوا وُجوهکم و ایدیَکم الی المرافِقِ و امسحوا برؤوسِکم و ارجلکم الی الکعبین»[١] واتە ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە! نوێژ بکەن و دەم و چاوی خۆتان بشۆرن دەسی خۆتان و پاتانیش تا گوێزنگ بشۆرن. دەبێ بزانین کە پێویستی دەسنوێژ ئەوەیە کە سوننەتە ڕوو بە قیبلە دانیشن و مەزمەزە و نیستنشاق کردن واتە ئاو بە دەم و لوتیا بێنێ و لە دوای ئەمە ڕووکاتە شۆردنی ڕووخساری بەم جۆرە کە ئاوەکە بە دوو دەستی هەلگرێ و بیکاتە ڕووخساریدا. دەبێ ئاوەکە لای ژووروی سەری واتە توێڵی بگرێت و تا چناۆکی بێت و لەو دووا تا ئەم بەرونەوبەری گوێ (بین‌الاذنین) بگرێتەوە. ئەگەر کابرا (کثیراللحیة) بوو واتە ڕیشی زۆر بوو، دەبێ ڕووخسارە و زاهیری ڕیشەکەی بشوا و بەس. ئەگینا ڕیشەکەی خاو و تەنك بوو دەبێ دەری ڕیش و بنی ڕیشەکەشی بشۆرێ تا ئاوی دەسنوێژەکە بە بنی هەموو موەکاندا

---

١- المائده/٦

بگەڕێ.

نیەت: یەکەمیــن شەرتی دەسنوێژە، و ئەمەیە کە لە وەختی ئاو هەڵگرتنـدا بڵێـت: «نویـت رفـع الحدث»[١] لـە دوادا ئاوەکـە بڕژێنێتـە ڕووخســار، تـا ئەگاتـە چناوك. وشەی نیەت دەبێ تەمام بێت کە زانایـان فەرموویانـە: «نیـت حـدث» و دەبێ دەست بە ئاخری ڕووخسـار واتە چناوك بگات. و ئەم دوو کارە، واتـە نیـەت و حەرەکەتی دەس دەبێ موافیـق بن. نە ئەمە کە یەکەم نیەتەکە بڵێت و لە دوادا ئاوەکە کەیتە ڕووخسارتا. کە دەسنوێژەکەت بەتاڵ دەبێتەوە. زانایـانی نیجتیهـاد فەرموویانە، ئەگەر لە کاتی بە زووان هێنـانی نیەتا وشەی «حکم» بەجێ بهێلێ و ئەم وشەیە بە زوان نەیەت، دەسـنوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. چونکە بێ وشـە «حکـم» حەدەس واتە پیســی لاناچێت. دەبێ سـێ جـار ئاوەکـە بـە ڕووخســاریا بهێنی کـە یەکەمیـن جاری واجیبە و ئەوانیتری سونـەتە. لە دوادا دەبێ دەسـتی ڕاسـتی و ئینجا دەسـتی چەپیشی بشۆرێ. بەم جۆرە کە ئاو لە سـەری ئەنگوسـتی بتکێ تـا ئەگاتە ئانیشـکی. ئەمەش دەبێ سـێ جـار بـێ، یەکـەمی واجیبـە و ئـەوانیتـری سونـەتن. باشتـرە واتە موستـەحەبە بە قەدەری چوار ئەنگوست بانتـر لە ئانیشـك بشوا. لە دوای شۆردنی دەس، دەبێ دەسـتی تەڕی بە سـەریا بکێشی، واتە سـەری مەسح کا. لە بارەی مەسحی سـەر چـەند ڕەوایـەتێ هـاتووە. بـە بڕوای بـڕێ لـە زانایان بەسـیەتی کە دەسـتی تەڕی بە مەلاژگیا بێنێ. بڕێکیـان بڕوایـان وایـە کـە لای کەم دەبێ یەك بەش لە سێ بەشی سەر بشـۆرێ. چـەند زانـایکی دی دەڵێـن، شۆردنی یەك بەش لە چوار بەشی سەر بەسـیەتی، وتوویانـە ئەگـەر کـابرا زۆر لـە

---

١ - واتە: نیەتم هەیە پیسی لە لەشم لابەم.

خواترس و دەوریش بوو باشترە تەواوی سەری بشۆری، چونکە خودای گەورە فەرموویەتی: «فامسحوا برؤوسکم و ارجلکم» زانایان وتوویانە وشەی «فامسحوا» دەگەڕێتەوە سەر وشەی «فاغسلوا» کە واتە بە ڕەهنمونی ئەم ئایەتە دەبێ سەر و پایش بشۆرین. بەس چونکە شۆردنی سەر بڕێ دوور ئەنوێنێ دەبێ بڵێن مەسحی سەر کافیە. مەسەلا ژن کە «کثیرالشعر»ە واتە قژی زۆرە و لەچکی هەیە کە لابردنی لە پێنج نوێژەکا نابێ، بۆ ئەو بەسیەتی کە دەستی تەڕکا و بە سەر مەلاژگیا بیکێشی. باشتر ئەوەیە کە دەس بهێنێتە سەر ئەو شتەی کە بە سەریا هەیە و بە مەسح دەستی بکێشێ بە دەوری تەواو سەریا. لە سەر بڕوای مەزهەبی حەنەفی سونەتە کە دەس بکێشی بە پشتی گوێچکەیدا. لە سەر بڕوای زانایانی شافیعی ئەمە قسەیکی دروست نیە. لە دوای ئەمە، نۆگەی پا دەگەیت. کە دەبێ یەکەم جار پای ڕاستی و لە ئەنجام دا پای چەپی بشۆری. دەبێ پای بشۆرێ نە ئەمە کە مەسحی بکا. واجیبە کە هەر پای سێ جار بشۆرگێ کە یەکەمین جاری واجیبە و ئەوانیتری سونەتە. هەروەها پا، کە ئەجاسەتی زۆری لی ئەکەوێ، باشترە سێ جار بشۆرگێ ئەگەر پاك بێت. شۆردنی یەکەم جار واجیبە وەلێ دووهەمین و سێهەمین سونەتی حەزرەتی ڕەسوولن. ئەگەر پای کەسێ پیس بێ جاری ئەوەڵ و دووهەم سونەتە کە لە ناپاکی پاکی کەنەو و جارێ سێهەم واجیبە کە، بەجێی ئەهێنن. زانایانی شێعە پێیان وایە کە شۆردنی پا پێویست نیە و هەر ئەو ئایە بە دەلیل دێنن کە وشەی «ارجلکم» بە کەسرە دەخوێنن وەلێ زانایانی شافیعی بە لامی مەفتوح دەیخوێنن. شێخ

بەهایی[١] و چەندێ لە زانایانی سوننی بڕوایان وایە کە باشترە پیاو پای بشۆرێ و مەسحیشی بکێشی. جا نیتر جێگەی باسە، کە ئەووەڵ مەسح بێ جا غوسڵ یان یەکەم غوسڵ بێ جا مەسح. زانایانی سوننی بڕوایان وایە کە ئەگەر سەری مەسح کێشی دەبێ بە دوو دەستی ئەم کارە بکا، دەستێکی لە ڕووی پا و دەستێکی دیش لە پشتی پا. بەس زانایانی شیعە لایان وایە کە هەر بەو ئاوە کە ڕووخسار و دەستیان پێ شۆردووە دەتوانێ مەسحی سەر و پایش بکێشێ. ئەم ڕای و بیرە لە لای زانایانی سوننی بێ بایەخە و بە قسێکی جوان هەڵناگرێ چونکە ئەو ئاوە (مستعمل)ە واتە یەك بار بە کار هێناوەوە دروست نییە جارێکی دی بۆ دەسنوێژ بە کار بهێنرێ.

**ئەو شتانەێ لە دەسنوێژا بە تایبەتی بە شەرت گیراون**

**شەرتە تایبەتەکانی، شەش دانەن**

**یەکەم: نیەتە**

**دووهەم: شۆردنی ڕووخسارە**

**سێهەم: شۆردنی هەر دوو دەستە**

**چوارەم: مەسحی سەرە**

**پێنجەم: شۆردنی هەر دو پێیە**

---

١- ناوی بەهای کوڕی موحەممەدە و بە شێخ بەهایی ناوبانگە (٩٥٣-١٠٣١) لە زانایانی بەناوبانگی شیعەیە کە لە بەعلەبەك بە دنیاهاتووە لە ئیسفەهان مردووە و لە مەشهەد نێژراوە. بەشێ لە کتێبەکانی وەکو: «مشرق‌الشمسین و اکسیرالسعادتین» «جامع عباسي»، «حبل المتین في إحکام احکام‌الدین»

**شەشەم: تەرتیبە**

دەبێ بزانی دەسنوێژ بەم جۆرە دەگیرێ کە وترا. نە ئەمە کە یەکەم پای بشۆرێ بە دوادا ڕووخساری ودەستی بشۆرێ. بە واتەی ئایەی قورئان دەبێ یەکەم بە شۆردنی دەست پێ کا و لە دواییدا پای بشۆرێ. زۆری لە موجتەهدین و زانا ئایینیە گەورەکان وەکو حەزرەتی ئیمامی غەزالی[1] و چەند عالمی دیکە فەرایزی نوێژیان بەم تەرتیبە نێو بردووە: یەکەم ئەگەر کەسێ وشەی کوفری - نعوذبالله- بە زارا هێنا دەبێ بە پەلە و بە زودی ئیستیغفار بکا و شەهادە بێنێ بە دوای ئەوەدا دەسنوێژ بگرێ ئەگینا دەسنوێژەکەی بەتاڵە. دووهەم دەبێ بە یەقین باوەڕی بێ کە دەسنوێژ، فەرزی ئەسایە. سێهەم ئەوەیە کە لە کاتی دەسنوێژدا عاقڵ و بە هۆش بێ. چونکە دەسنوێژ لە کاتی مەستی و زایەبوونی عەقڵدا بەتاڵە و دانامەزرێ. ئەگەر دەسنوێژی ببێ جا یەکێ لەمانە ڕووی دا واتە مەست بوو یا عەقڵی بە زایە چوو، ئیتر دەسنوێژەکەی بەتاڵ دەبێ. چوارەم نیەتە. دەبێ بە دڵیا بیت کە دەمەوێ نوێژ بۆ خۆم موباح کەم. یا ئەمە کە

---

[1] - ئیمام موحەممەدی غەزالی، ناوی موحەممەد کوڕی موحەممەد کوڕی موحەممەد، کە لە ساڵی ۴۵۰ مانگی لە شاری تووس لە ئێران هاتوەتە دنیا و لە ۵۰۵دا پێش دنیای بەجێهێشتووە. ۳۸ ساڵی بووە کە بە نازناوی حجةالاسلام لە مەدرەسەی نیزامیەی بەغدا دەرسی وتووەتەوە بەڵام لە ساڵی دوایدا هەموو شتێکی بەجێهێشتووە و بۆ ماوەیێکی دە ساڵ بە ئەنعاسراوی ژیاوە و تا ئاخری عەمری لە دنیا و دنیادۆستان دووری گرتووە. ئیمامی غەزالی زانایێکی زۆر پایەبەرز بووەوە کتێبەکانی توانیویانە لە مێژووی زانستە ئیسلامیەکان جێگایێکی هەرە بەرز بۆ خۆیان دانێن. زانایانی کورد زۆر ئەم زانا گەورەیان خۆش ویستووە و کتێبەکانیان خوێندوەتەوە و تەنانەت بەشێکیشیان بە کوردی وەرگێڕاوەتەوە. کتێبە تایبەتیەکانی بریتین لە ﴿احیاء علوم الدین﴾ ﴿المستصفی﴾ ﴿الاقتصاد فی الاعتقاد﴾ ﴿الجام العوام عن علم الکلام﴾ ﴿کیمیای سعادت﴾

دەمەویٚ حەدەس و ناپاکی لە خۆم پاك بکەمەو. پێنجەم ئەمەیە کە لەو کاتە کە ڕووخساری دەشوا نیەت بێرێت. هەروەها پێشتریش وتمان. ئەگەر پێش لە شۆردنی ڕووخسارە و دەموچاوی، نیەت کات و لە دوادا ئاوەکە بڕژێنیٚ، ئەوە دروست نیە. شەشەم شۆردنی ڕووخسارە کە دەبیٚ ئاوە کە بە بنی ڕیشی کابرا بگات ئەگەر ڕیشەکەی کەم و تەنك بێت. بەس ئەگەر ڕیشەکەی زۆر بوو -هەر بەو جۆرەیە کە پێشتر وتمان- ئەگەر دەری ڕیشی بشۆریٚ بەسیەتی. حەفتەم، شۆردنی دوو دەست تا ئانیشکە. هەشتەم، مەسحی سەرە کە بە کەمترین قەدەر دێتە دی. نۆهەم شۆردنی هەر دوو پایە تا گوێزنگ. ئەم زانایانە فەرموویانە کە ئەگەر تلێشاوی لە پا بێت واجیبە کە نێوی ئەو تلێشاوەش بشۆریٚ. دەهەم تەرتیبە. بە ئەو جۆرە کە پێشتر وتمان واتە لە ڕووخسارە و شروع دەبی و لە ئەنجامدا پای ئەشۆریٚ. لە وتەی ئیمامولموتەقین ئیمام شەمسەدین[1] وا حالی دەبم کە لە وەختی دەسنوێژا ڕوو بە قیبلە دانیشیٚ بەس نابیٚ ئاوی دەمی ڕوو بە قیبلە داخا. و هەروەها نابیٚ ئاوی دەم و لووتی ڕوو بە خەلکی یا لەسەر ڕێگەی موسولمانان داخات. چونکە تەرکی بەشێکی کورت لە ئەدەب و بەجیٚ نەهێنانی ئەو ئەدەبە دەبێتە هۆی دووربوونی زۆرزۆر لە رەحمەتی خودا. باشترە لە وەختی شۆردنی هەر کام لە پەلەکانی خۆی سەلەواتی لەسەر حەزرەتی موحەممەد(د.خ) بنێری. هەروەها نیەت ئەهێنیٚ کە زاهیری پاکە و کات دەبیٚ نیەتی پاکی دلٚ و

---

١- ئیمام شەمسەدین ڕەمەلی (٩١٩ تا ١٠٠٤ قمری) لە شاری قاهیرە لە میسر بە دنیا هاتووە. پێیان دەوت شافعی صغیر زۆربەی کتێبەکانی لای بابی خوێندووە و نیازی بە زانایانی دی نەبووە. لە عەرەبی و تەفسیر و حەدیس و ئوسولٚ و فورووع و زانستە عەقلیەکان زۆر بەبەهرە بوو. کتێبە مەشهوورەکەی کتێب (نهایةالمحتاج الی شرح المنهاج)

دەروونیش لە وەسوەسەی شەیتان بپارێزێت و دەبێ قیبن و قولمی لە سەر موسوڵمانان لابات. سوننەتە بۆ دەستنوێژگر کە لە کاتی دەستنوێژ گرتنا هیچ نەڵێ و لە باس و قسە کردن واز بێنێ، هەروەها سوننەتە کە لە پاش تەواو کردنی دەستنوێژەکەی دە جار سەڵەوات بنێرێ لە سەر پێغەمبەری مەزن(د.خ) و لەسەر ئال و سەحابەیشی. ئەو کەسەی سەڵەوات بنێرێ لە ڕۆژی قیامەتا زۆر سووك و بە ڕاحەتی نەجاتی دەبێت. لە کاتی شۆردنی پای چەپ موستەحەببە کە سوورەی «انا انزلناه» و «قل هوالله احد» بخوێنێت. دەبێ لە دوای دەستنوێژ گرتن دەستی بلاو نەکات و ناوی زۆریش بە کار نەهێنێ. کە شەیتان زۆر حەزی لە ڕژانندنی ناوی بە هەڵەیە. موستەحەببە لە کاتی دەستنوێژ گرتنا ئەم دوعایانە بخوێنێ بەم تەرتیبە کە دەوترێ. لە دوای شۆردنی ڕووخسار بڵێت: «اللهم بیض وجهي بنورك یوم تبیض وجوه و تسودّ وجوه»[١] و لە کاتی شۆردنی دەستی ڕاستا بڵێت: «اللهم اعطني كتابي بيميني و حاسبني حسابا يسيرا»[٢] و لە وەختی شۆردنی دەستی چەپا بڵێت: «اللهم لا تعطني كتابي بشمالي و لا من وراء الظهر»[٣] و لە وەختی مەسحی سەرا بڵێت: «اللهم حرّم شعري و بشري على النار»[٤] و لە کاتی شۆردنی پا دەبێ بڵێت: «اللهم ثبت قدمي و قدم والدي على الصراط

---

١- واتە: خودایا لەو ڕۆژەی کە بڕێ کەس ڕوویان ڕەش دەبێ و بڕێ کەسیش ڕوویان سپی دەبێ، هیوام بەوەیە ڕووخساری من سپی کەیت و لە نێو ڕووسپیانا بم.

٢- واتە: خودایا نامیلکەی ئەعمالم بە دەستی ڕاستم بدە و حسێب من بە هاسانی و ڕاحەتی کۆتایی پێنە.

٣- واتە: خودایا نامیلکەی ئەعمالم بە دەستی چەپ مەدە و لە پشتی سەریشم ئەو نامەم پێ مەدە.

٤- واتە: خودایا پێست و قژم لە ئاگر بپارێزە.

یوم تزل فیه الاقدام»[1] نیبن حەجەر دەڵێ کە ئەم حەدیسانە مورسەل نین وەلێ ئەگەر کەسێ سۆفی بێ باشترە ئەمانە بڵێت.

باسی دیکە لە باتی بەتاڵبوونی دەسنوێژ

زانایانی شەریعەت بە ئەو شتانە ئەسبابی حەدەس دەڵێن واتە ئەو شتانەی کە دەبنە هۆی بێ دەسنوێژی، کە بریتین لە پێنج شت: یەکەم خووروج واتە هاتنی وەزی و مەزی و با، لە بەر و پشت، یا گمێز (بول) و چەپەڵی (غائط). هەر یەك لەمانە دەسنوێژ بەتاڵ دەکەنەوە. پێویستە بزانی کە هاتنی وەزی و مەزی ڕۆژوو ناشکێنن و غوسڵیان پێ واجیب نابێ بەس دەسنوێژ بەتاڵ دەکەنەوە. دووهەم زەوالی عەقڵە، کە شێتی بێ یان مەستی یان بێهۆشی و بێحاڵی. هەر کام لەمانە عەقڵ زایە دەکەن و دەسنوێژ بەتاڵ دەکەنەوە. سێهەم دەس دان بە کەسێکە کە بە تۆ نامەحرەم بێ. ئەگەر دەس بدا لە موو یان نینۆك یان ددانی، ئەوە دەسنوێژ ناشکێنی. چونکە ئەمانە هیچ کام غەریزە هان نادەن. بەس دەس دان یا پێکەوە بوونی ئەو ئەعزایەتر دەسنوێژ بەتاڵ دەکاتەوە. چوارەم ئەوەیە کە دەس بە بەر و پشت بدات. جا چ ژن بێ و چ پیاو بێت. پێنجەم خەونە، کە دەسنوێژ بەتاڵ دەکاتەوە. نووسەری کتێبی فەرز و سونەت لەم بارەوە وتوویەتی:

از سبیلین هرچه شد نازل | می کند بی گمان وضو باطل

---

[1] - واتە: خودایا لەو ڕۆژە کە هەموو ئەدەمی لە سەر سیرات دەلەرزێ خۆت یاری خۆم و دایك و بابم دە کە بە قورسی و باشی لە سەر سیرات هەڵکەوین.

خواب بر متکا و بر مسند    لمس نامحرم و زوال خرد

واته: هەرچی کە لە بەرودواوە بێتە دەرێ دەستنوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، هەروەها خەون بەسەر بالگە و سەرین و بە سەر فەرش و یا دەس پێدان و لەمسی نامەحرەم و زەوالی عەقڵ.

زانایانی حەنەفی پێیان وایە کە هەرچی لە بەدەن بێتە دەرێ دەستنوێژ بەتاڵ دەکاتەوە. وەکو ڕشانەوە و قەی کردن یان فەسد و حەجامەت یان ئەو خوێنەی کە لە سوزن بێتە دەرێ. زانایانی شافیعی بەم قسە باوەڕیان نییە. زانایانی شێعەیش پێیان وایە کە دەس بە بەر و پشت و نامەحرەم دەستنوێژ بەتاڵ ناکات. بڕوای زانایانی شافێعی جگە لەمەیە و ئەم قسە و ئەم ڕوانگەیە بە لایانەو بایەخێکی نییە و بە هیچ دانانرێ.

خودای گەورە لـە قورئانـا لـە باسـی فـورووعی ئایینـا دەفـەرموێ: «اقیموا الصلاة و آتوا الزکاة». دەبیٚ بزانیـن کە نوێژ فەرعی ئەوەڵ لە فورووعی ئاییـنـە و دەبیٚ بە جیٚ بهیٚـنریٚ. لیٚکۆڵینەوەی وشەی (اقیموا الصـلاة) واتـە بـەرزەو بنـەوە یان بەرزی کەنەوە نوێژەکانتان لەبەر دوعا کردن چونکە لە زوانـی عـەرەب صـلاة بە مانای دوعاس و لە شـەریعەتی پێغەمبـەرا[(ص)] نوێـژ بریتیـە لـە چـەند کـاری تایبـەتی و چەند قسـەی تایبـەتی کە بە (اللّٰه‌اکبـر) شـروع دەبـی و بـە سـلاودانەوە تەواو دەبیٚ. بەنا بەمە نوێژ بریتیـە لـە چـەند پێویسـت (شـرط) و چـەند ڕوکـن و چەند هەیئـەت و چەند ئەبعاز.

پێویستـەکانی نوێژ پێنج شتـن.

پێویستی ئەوەڵ: پاکیە واتە تەهارەت و دەسـنوێژ.

پێویستی دووهەم: پاکی و خاوێنی جێگای نوێژ و سـیاڵ و لەشە.

**پێویستی سێهەم:** داپۆشینی شەرمی ژن و پیاوە. جا بۆ ژن دڵی پا و مووی ڕووخساری ئەگەر وە دەرکەوێ ئەوە نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە.

**پێویستی چوارەم:** نەخواردن و نەنۆشینەوەیە و هەروەها دووری لە هەر کاری کە گفتوگۆیەوە.

**پێویستی پێنجەم:** زانینی وەختی نوێژە.

**ئەرکانی نوێژ** واتە ئەو شتانەی کە نوێژ بەوانە پێك دێت، سیانزەن:

**یەکەم، نیەت:** یانی قەصد و مەبەستی ئەنجام و مەبەستی فەرز و مەبەستی تەعیین. بەم جۆرە کە بێژی، نیەتم هەیە کە نوێژی فەرزی سوبح یان مەغریب (نوێژی شەوان) یا ئەو نوێژانی دی بەجێ دێنم. مەبەستی ئەنجام یان فعل بریتیە لە نوێژ وتنەوە، و مەبەستی فەرز بریتیە لە وتنی وشەی فەرز و مەبەستی تەعیین ئەوەیە کە بە جوانی ڕوون و ئاشکرا بێ کە کام نوێژت دەوێ. ئەگەر دەتەوێ بە وشەی عارەبی نیەت بێژی ئاوا بێژە مەسەلا: «**اصلي صلوة الفريضة هذا العصر يا هذا المغرب**»[1] وتنی ئەندازە و عەدەدی ڕەکعەت لە نیەتا واجب نیە. ئەگەر کەسێکیش ئەمەی نەیزێت نوێژەکەی بەتاڵ نابێت. زۆربەی موجتەهیدان وتوویانە ئەگەر لە وەختی نیەت و (**اللّٰه اکبر**) وتن دڵی کابرا تووشی وازوازی و خەیاڵ بێ ئەوە نیەتەکەی دروست نیە و نوێژەکەی بەتاڵ نەبێت. لە وەختی نیەت و (**اللّٰه اکبر**) وتن دەبێ ئەوەندە دڵ و خەیاڵی پاك و

---

[1] - واتە: دەمەوێ نوێژی عەسر یان نوێژی شەوان بەجێ بێنم. پێویستە بزانین بە زوان هێنانی نیەت بۆ دروستی نوێژ پێویست نیە و نیەتی قەلب کافیە، یان ئەگەر کەسێ پێی خۆش بێ ئەتوانێ نیەتەکەی بە زمانی کوردی بێنێ. چونکە نیەت بەر لە نوێژەوە نایەوێ بە عەرەبی بێت.

خاوێن بێ کە چما زوان و دڵ پێکەوە وشەکان دەڵێن. ئەلبەت عالمی پایەبەرز ئیمامی غەزالی فەرموویەتی هەر ئەمە کە لە دڵا نیەت کەی و وشەی اللّٰهاکبر بە دل بێنیٚ بەسیەتی.

دووهەم: تەکبیر واتە وتنی (اللّٰهاکبر): ئەگەر کابرا یان بە قەصد یان بە هەڵا ئەم وشە بە زوان نەهێنێ یان وشەکە لە دڵەو بهێنێ و بە زلرا نەیهێنێ، نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. یان ئەگەر لە جیاتی ئە و وشەیە (اللّٰهالجلیل) یان (اللّٰهالعظیم) بێژی باز ئەوە نوێژ بەتاڵ نەبێتەوە.

سێهەم: ڕاوەستانە بۆ خوێندنی نوێژ (قیام). دەبێ بە جۆرێ ڕاوەستێ کە زنجیرە و مۆرەی پشتی بە جوانی و ڕێکی بۆنێسێ. و نابێ پاڵ بەشتێکەوە بنێ یان بەملا و بەولا لارەو بێت کە ئەمانە نوێژەکە بەتاڵ دەکەنەوە. هەروەها دەبێ ڕاست و جوان ڕاوەستێ کە پشتی کوم نەبێتەوە بەو شەرتەی کابرا بتوانێ؛ ئەگینا ئەگەر کابرا زۆر نەخۆش بێ و نەشتوانی ڕاوەستێ دەبێ بە دانیشتن نوێژەکەی بەجێ بێنێ کە لە کاتی ڕوکوع و سەجدە بە ڕاسا لارەو بێتەوە و شەرتەکانی نوێژ بەجێ بێنێ. ئەگەر نەیتوانی دانیشی واجیبە کە بەرەو قیبلە شانی داخات و بەسەر ئیشارە کات. ئەگەر نەخۆشیەکە بە ڕادەیێک بێ کە تەنانەت نەتوانی برویشی تەکان بات، ئیتر نوێژەکەی بە جۆری بەجێ بێنێ کە بتوانێ بە زمان بێژی.[1]

چوارەم: خوێندنی سوورەتی فاتیحەیە، بۆ کەسێ کە توانای بێ ئەم سوورەتە بخوێنێ یان فێری بێ دروست نییە بەجێ ئەم سوورەتە سوورەتێک یان

---

[1] - لە فارسیەکەشدا تۆزێ عیبارەتەکە ناڕاستە.

چەند ئایەتێکی دی بخوێنی. بەڵکو خوێندنی فەرز و واجیبە، کە لە ڕەکعاتی یەکەمی هەموو نوێژی فەرز یان سوننەت دەبێ سوورەتی حەمد بخوێنری و لە نوێژی فەرزدا بە دوای سوورەتی حەمد لە دوو ڕەکعەتی پێشدا یەکێ لە سوورەتەکانی قورئان یان چەند ئایەتی بخوێنێت. ئەڵبەت لە واجباتی نوێژ نییە. بەس سواوی لە سەرە. ئەگەر کەسێ سوورەتی حەمدی نەخوێندبێ یان نەتوانێ فێری بێ، دەبێ بە قەدەری ئایاتی ئەو سوورەتە کە حەفت ئایەتن، ئایەی قورئان بخوێنێ و ئەگەر ئەمیشی بۆ دەس نەکەوت، دەتوانێ بە قەدەری ئەو سوورەتە وشەی «سبحان‌الله» بێژێت. ئەگەر ئەمیشی نەتوانی دەبێ هەر وا بە پاوە ڕاوەستێ بە قەدەری نوێژ کردنێك. ئەگەر کەسێ سوورەتی فاتحە بخوێنێ یان فێری ببێ و یەکێ لە حەرفەکانی کە بریتین لە سەدوچل و سێ حەرف بگۆڕێ مەسەلا صاد بکا بە سین، بێ تەردید نوێژەکەی بەتاڵە و ئەگەر نەتوانێ فێری ببێ بەتاڵ نابێت.

پێنجەم: ڕوکوعە، دەبێ ئەوەندە دابنەوێتەوە کە دڵی هەر دوو دەستی بگەن بە سەری ئەژنۆکانی. بۆ ژنان وایە کە دەستی لە یەك بڵاو نەکاتەوە و هەر دوو دەستێ بە پاڵی خۆیەوە بلکێنێ. و نیەتی ڕوکوعی لێ بێنێ و ئەوەندە لە ڕوکوع بمێنێتەوە کە سێ جار و بە قەولێ حەفت جار و بە قەولی ئیبن حەجەر زیاردە جار (سبحان ربي العظيم و بحمده) بخوێنی. دەڵێن کە لە کاتی ژیانی حەزرەتی ڕەسول -درروودی خوای لە سەر بێ- لە ڕوکوع و لە سوجودیش (سبحان الله) یان دەگوت، کە حەزرەتی جیبریل هاتە خوار و ئەم ئایەتەی نازل فەرموو

که: «فسبح بحمد ربك العظيم»[1] کـه بـه دوای ئه‌مـه‌دا لـه ڕوکوعـدا «سـبحان ربـي‌العظـيم» یـان ده‌گـوت و لـه سه‌جده‌یشـدا نایـه‌تی جوانی «سـبح اسـم ربـك الاعلى» هاته خوارێ که «سبحان ربی الاعلى» یان بۆ سه‌جده دانا.

شه‌شه‌م: ڕاست بوونه‌وه واته (اعتدال)، که ڕاست بوونه‌وه له ڕوکوعـه، بـه نه‌وعێ که کابرا به قه‌ده‌ری ڕلوه‌ستان واته قیام بگعیت، کـه لاری لـه زنجیـره‌ی پشتی کابرا بکه‌وێ. نه ئه‌مه که کابرا له خۆڕا هه‌روا به سـه‌جده بـڕوا. ده‌بیّ لـه ڕاوه‌ستانیش دا نه‌وه‌نده‌ی پیّ بچیّ که بتوانیّ لای که‌م بوو یه‌ك جار وشه‌ی «سمع الله لـمن حـمدة ربنا لك الـحمد» به زلرا بێنیت.

حه‌وته‌م: سه‌جده‌یه که بۆ خۆی چه‌ند فـه‌رزی هه‌یـه. یه‌کـه‌م ئه‌وه‌یـه کـه لـه سه‌جده ده‌بیّ نه‌وه‌نده بـمێنی که جاری که‌م سیّ بار به ئه‌هوه‌نی و بیّ په‌له وشه‌ی «سبحان ربي الاعلى و بـحمده» بـخوێنیّ. ئـه‌وی‌تـر ڕوون کـردن و ئاشـکراکردنی توێڵه، واته توێڵ له‌و جێگایه دابنیّ که بۆ سه‌جده دانراوه. که نـابیّ شـتیّ وه‌کـو پووشاك مه‌سـه‌لا، سـه‌ری پشـتێنێکی درێژ لـه بـه‌ینی توێـڵ و ئـه‌و جێگـا بـی. هه‌روه‌ها ڕه‌شتی و کلاو بۆ پیاوان یان له‌چکی ژنـان کـه بـۆ نوێـژ کـردن بـه سـه‌را ڕانه‌کێشن نابیّ له بـه‌ینا بێت. ئه‌گه‌ر یه‌کیّ له‌مانه له وه‌ختی سـه‌جده بـه تـوێڵی کابراوه بێت نوێژه‌که‌ی به‌تاڵ ده‌بێته‌وه. پێویسـته حه‌وت جێگای بنیاده‌م له وه‌ختی سه‌جده‌دا، به سـه‌جده بن. که بریتیـن له‌مانـه، توێـڵ، دوو ئـه‌ژنۆی، دڵـی ده‌سـت یانی به‌ری ده‌ستی له‌گه‌ڵ ئه‌نگوسته‌کانی پای کـابرا. لـه وه‌ختی سـه‌جده‌دا ده‌بیّ باری قورسی ئه‌عزای بنیاده‌م که‌وێته سـه‌ر ملـی و ملـی سـه‌ری بـه قـه‌ده‌ریّ کـه

---

[1] - الحاقة/ ٥٢ تۆ به یادی ناوی په‌روه‌رنده‌ی گه‌وره‌ت، هه‌ر پـه‌سنی پاکی ئه‌و بده. (هه‌ژار)

ئەگەر دوو دەنکە ترێ سەرمابردوو یان قوڕە کەوتبێتە ژێر تەوێڵی کابرا بە یەك جاری بترەکێ. ئەگەر قورسی بەدەن نەکەوێتە سەر و دەستی کابرا، ئەوە ئیتر نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. هەروەها واجیبە کە جێگای سەجدە لە جێگای دانیشتن خوارتر بێ، کە زانایانی شەریعەت تەمەککونێ (تمکن) پێ دەڵێن. ئەگینا جێگای سەجدە لەوێتر بەرزتر بێ‌نوێژی کابرا بەتاڵە.

هەشتەم: دانیشتنە لە بەینی دوو سەجدە بە دوای سەرهەڵێنان لە سەجدەی پێشوو. لە وەختی دانیشتندا دەبێ ئەوەندە ئەهوەن و ئارام بێ کە بە بێ پەلە و هەوڵێ بتوانێ ئەم عیبارەتە بێژێ «رب اغفرلي و ارحمني و انت خيرالراحمين» لە دوادا بۆ سەجدەی دووهەم بڕوا کە ئەویش دەبێ هەر وابێ کە وتمان.

نۆهەم: دانیشتنە (قعود) بۆ خوێندنی تەحیات. کە لە تەحیاتی ئەوەڵ دەبێ کابرا پای چەپی لە ژێر خۆیا بخەوێنێ و ئەنگوستانی پای ڕاستی بەرەو ڕاست داخا و تەحیات بخوێنێ و لە تەحیاتی دووهەمدا دەبێ هەر دوو پای بخەوێنێ بەم جۆرە کە ئەنگوستانی بە لای چەپا بڕوا و پاژنەشی بە لای ڕاستا کەوێ.

دەهەم: خوێندنی تەحیاتی دووهەمە کە لە بەینی خەڵکیدا ئەیشن و لە نوسخەی ئیبن حەجەر لە حەزرەتی عەبدوڵلای کوڕی عومەر -خوایان لێ ڕازی- ڕەوایەت کراوە، کە حەزرەت عەبدوڵڵا دەفەرموێ کە بۆ خۆم لە حەزرەتی پێغەمبەرم بیست کە لە نێو نوێژدا کە تەحیاتی خوێند فەرمووی: «التحيات المباركات الصلوات الطيبات لله السلام عليك ايها النبي و رحمةالله و

برکاته والسـلام علینـا و علی عبـادالله الصـالحیــن»[١] لـه دوادا سـه‌ڵەوات و کماصلیـت. له کعبالاحباریش ڕەوایەت کراوه که خۆم له زوانی پێغەمبەرم بیست کـه فـەرمووی: «التحیـات الزاکیـات لله السـلام علیـك» هـەروەها لـه دایکـی ئیمانداران، حەزرەتی عایشەیش[٢] دروودی خودای لەسەر بێ ڕەوایەت کراوه که لـه وەختی نوێژدا بۆ خۆم گوێم لـێ بـوو کـه حـەزرەت -درودی خـوای لەسـەر بـێ- فەرموویان: «بسم‌الله و بالله، اشهد ان لااله‌الا الله واشهد أن محمداً رسول‌الله» بەو جۆرەی که شێعاکانی ئیمامی دەیخوێنن.

یازدەهەم: سـەڵاوات دانە بە شوێن تەحیاتدا لەسـەر حەزرەتی پێغەمبـەر(ج.ه) جا ئەگەر کەسـێ خوا له قەسـدی یان به لەبیـرچوون بـێ، سـەڵاواتی نەنێرا، ئـەوە نوێژەکـەی بـەتاڵ دەبێتـەوە. کـەوابوو بـە دوای تـەحیات واجیبـە کـە وشـەکانی سەڵاوات بێژی.

دوانزەهەم: سڵاودانەوەیە. جا چ سلام علیکم یا السلام‌علیکم بێت جیاوازی نییە و هەر دووی دروستـە. وتنی وشەی «ورحمه الله» سونەتە و «و برکاته» نـە

---

١ـ البخاری ژمارەی ٧٨٨ قال عبدالله کنّا اذا صلّینا خلفَ النبيّ صلى الله علیه و سلم قلنا السّلامُ علي جبریلَ و میکائیلَ السّلام علي فلان و فلان فالتفتَ الینا رسولُ الله صلّي الله علیه و سلم فقال انَّ الله هو السّلامُ فإذا صلّي احدکم فلیَقُل التّحیّات لله و الصّلوات و الطیّبات السّلام علیك ایّها النبيُّ و رحمة الله و برکاتُه السّلامُ علینا و علي عبادالله الصّالحین فانکم اذا قُلتموها اصابت کلَّ عبد لله صالح في السّماء و الارض اشهدُ ان لا اله الا الله و اشهدُ انَّ محمّدا عبده و رسوله.

2 ـ موطأ مالك ژمارەی ١٩٢ انَّ عائشه زوج النبي صلى‌الله علیه و سلم کانت تقول اذا تشهَّدت التحیات الطّیّبات الصلوات الزاکیات لله اشهد ان لا اله الا الله وحده لا شریك له و اشهدُ ان محمدا عبدالله و رسوله السّلام علیك ایها النبي و رحمه الله و برکاته السّلام علینا و علي عبادالله الصالحین السّلامُ علیکم.

فەرزە و نە سوننەتە. دەڵێن وتنی: «و برکاتـه» لـه سـڵاودانەوەدا دروسـت نییـە. هەروەها ڕوگەڕاندن بـه ڕاس و چـەپدا واجیـب نیـیـە و سـوننەتە. لـه سـڵاو دانـدا ئەوەی واجیب بێت هەر «السـلام علیـکم»ە و بەس. چەند شت لە نوێـژا هەیـه کـه نە واجیبە و نە سوننەتە کە لە دوایدا دێت. انشا الله تعالی.

سـیانزەهەم: تەرتیبـە، کـابرا دەبـێ بزانـێ ئـەرکانێ نوێـژ بـه چ تـەرتیبێ دەبـخوێنێ نە ئەمە کە لە پێشـا نییـەتی تـەحیات بـێنێ یـان پـێش لـە ڕوکـوع، سەجدە بەرێ. دەبێ بزانێ کە:

یەکەم نیەتە، دووهەم ڕاوەستانە سێهەم اللّٰاکبـرە چوارەم فاتـحەیە پێنجـەم ڕوکوعە شەشـەم ئیعتیـداله حەفتەم سـەجدەیە هەشتەم جولووسـە نۆهـەم قوعـوودە دەهەم تەحیاتە یانزەهەم سەڵەواتە دوانزەهەم سـڵاو دانەوەیە.

نوێژی خەوتنان و نوێژی شەوان و نوێـژی سـویح دەبـێ بـە جـەهری و دەنـگ بەرزی بـخوێنرێت وەلێ ژن دەبێ دەنگی بـەرز نەبێتـەو. نوێـژی نیـوەڕۆ و عەسـر دەبێ بەسـێتـر و دەنگ کورتی بـخوێنرێت. لە پێنج نوێژە واجیبەکانا دەبێ کـابرا جۆری نوێژەکەی بـخوێنێ کە خۆی بتوانێ گوێ بـە دەنگـی خـۆی بـدات. ئـەگینا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە.

باسی هەینەتی نوێژ:

دەبێ بزانی کە هەینەتی نوێژ بە ئەو ئەعماڵـه دەڵـێن کـه لـه نوێـژا واجیـب نیـن و فەرزیش نیـن. وەکو وتنی: «سبحان ربي العظيم» لـه ڕوکوعـدا. یـان لـه سـەجدەدا کە «سـبحان ربـي الاعلـی» بۆێـژرگێت. یـان وتـنی «سـمع‌الله لـمن

حمده» له ئیعتیدال یان ڕاست بوونەوەدا کە یان بە قەسدی یان لە ڕووی لە بیرچوون بێ و کابرا ئەنجامی ئەدا نوێژ بەتاڵ ناکات. هەروەها ئەگەر کەسێ لە ڕوکوع یان لە سەجدە بە تەنیا اللهاکبر بڵێت ئەوە نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە. چونکە ئەوەی دەبێ لە نوێژی فەرزدا بێت هەمان (اللهاکبر)ە کە نیەتە، ئەگینا ئەوانیتر سوننەتن کە ئەگەر کەسێ بە قەسد یان لە ڕووی هەڵە و سەهو تەرکی کات ئەوە نوێژ بەتاڵ ناکات بەڵام لە سواوی ئەوە کەم دەکاتەوە. و باشترە کە ئەو ئەعمالە بەجێ بهێنرێن.

**باسی ئەبعازی نوێژ (ابعاض)**

به شوێن ئەمانە ئەبعازە (ابعاض): کە ئەبعازی نوێژ بریتین لە پێنج شت.

یەکەم: قونوت

دووهەم: ڕاوەستان (قیام) بۆ خوێندنی قونوت

سێهەم: تەحیاتی ئەوەڵ

چوارەم: دانیشتن بۆ خوێندنی تەحیات (قعود)

پێنجەم وشەکانی سەڵاواتە لەسەر پێغەمبەر[د.خ] و لەسەر ئالیشێ

ئەگەر لە تەحیاتی دووهەم ئەم شتانەی کە وتمان کابرا لە قەسدی نەیکا، ئەوە ئیتر نوێژەکەی درووس نییە، وەلێ ئەگەر لە بەر نەزانین بێ نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە. وەلێ دەبێ بە شوێنی وتنی «انك حمید مجید» لە تەحیاتی دووهەمدا، سەجدەی سەهۆ ببا. بەم جۆرە کە لە دڵ نیەت بێری کە دەمەوێ سەجدەی سەهو کەم. و دوو جار سەجدە بکەی. ئەو دووجارەش لە بەر ئەوە کە

ئەگەر تەحیاتی نەکرد سەجدەیەك بۆ دانیشتنە و یەکێکی لە بۆ تەحیات. قونووت و سەڵاواتیش وایە و دوعای سەجدە ئەمەیە کە: «سبحان‌الذي لاینام و لایموت و لایسهو» ئیبن حەجەر ئەم قسەیە لای دروس نەبووە کە ئەگەر بە قەسدی تەرکی کات سەجدەی نابی.[1] بزانە کە ئەگەر لە نوێژدا ڕەکعاتی زۆرتر بەجێ بێنێ، دەبێ لەبەر ئەوەش سەجدەی سەهو بێری. بزانە کە بە بڕوای مەزهەبی شافیعی، نوێژە فەرزەکان، قونوتیان نابێ، جگە لە ڕەکعاتی. دووهەم لە نوێژی سوبح بە شوێن ڕاوەستاندا. بەس لە کاتی هاتنی موقەددەر و بەڵایەك وەکو سیاساڵی یان وەبا و تاعوون یان لە وەختی ترس لە پادشا یا دوژمن، لە وەختی ترس و هومێدا، خوێندنی قونوت لە نوێژە پەنجەکانا دەبێتە هۆی لاچوونی بەڵا. انشاالله هەر وایش دەبێ.

---

[1] - دەقی نووسراوەکەی ابن حەجەر وایە: «و ردە بان خلل العمد اکثر فکان الی الجبر احوج کالقتل العمد بالنسبە الی الکفارە»

ڕۆژوو بریتیە لەمە کە موسوڵمان تەواوی ئەعزای خۆی چ لە ڕواڵەت و چ لە ناوەڕۆکدا بپارێزێ. ڕۆژوو واجیبە کە لە قورئاندا فەرموویەتی: «کتب علیکم‌الصیام کما کتب علی‌الذین من قبلکم»[1] واتە: «ڕۆژگ لە سەرتان فەرز بووگە، هەروەها لەسەر ئومەمەتەکانی پێش ئێوەش فەرز بوو» وشەی «صوم» بە مانای پارێزە واتە دوورکردنەوەی تەواوی لەش و ئەندام.

دەبێ بزانی کە ڕۆژگ لەسەر ئەو کەسەی واجیبە کە موسوڵمان بێ و عەقڵی هەبێ، کەوابوو لەسەر کافر و شێت واجیب نابی. ژنی ڕۆژگەوان دەبێ لە خوێنی عادەت (حیض) و خوێنی زەیسانی (نفاس) خاوێن بێ. ئەگەر کابرای ڕۆژگەوان هەر لە سەرەتایش ڕۆژ تا شەو کە خۆر ئەنیشێ لە خەون بێ و جگە لە ماوەیکی کورت کە بێدار بێتەوە، ئەوە هیچ نوقسانی بۆ ڕۆژووەکەی وەپێش نایرێ. مەبەست لەو ڕۆژوەی کە یەکێ لە فورووعی ئایینە ڕۆژگی مانگی ڕەمەزانە. کە

---

١- البقرە/ ١٨٣

ڕۆژووە سوننەتەکانی وەبەرناکەوێ. بەس ئەم ڕۆژووە واجیبەی مانگی ڕەمەزان لەسەر کەسی ڕێبوار بێ بەو شەرتەی سەفەرەکەی موباح بێ و قەدەری مەسافەی قەسر بگرێتەوە، یان کەسی کە ناخۆش حاڵ بێ یان پیری زۆرهان بێ واجیب نابێ. وەلێ لە قەزاکردنەوە دەبێ بکۆشێ و فەدیەی ناوێ ئەگەر کەسێ لە مانگی ڕەمەزان[1] توخنی ژنەکەی کەوێ (نزیکی لەگەڵیا کا) هەم قەزای دەوێ هەم کەفارەی دەوێ. کەفارەکە دەبێ یان بەندیلێ ئازاد بکا یان دوو مانگی لە سەر یەك ڕۆژوو بگرێ، یان شەست فەقیری لاکەوتوو نان بدات. ئەگەر ڕۆژگی قەرز یان ڕۆژگی نەزر بگرێ، و نزیکی لە ئەهلی ژنیا بکا، باز دەبێ قەزای کاتەو بەس کەفارەی ناوێ. کەفارەکەش لەبەر ئەوەیە کە حورمەتی مانگی ڕەمەزانی شکاندووە. ئەگەر کەسێ بە شەوا نیەتی لە بیر چوو ئەوە واجیب نییە کە بە زمان نیەتی ڕۆژگ بێنێ. وەلێ دەبێ خۆی بپارێزێ. و دەبێ هەروەها ڕۆژگ بێ و ڕۆژی دوایین دەبێ ڕۆژووەکەی قەزا کات. وەلێ لە ڕۆژگی سوننەت ئەگەر کابرا نیەتی لەبیر چوو، بە ڕۆژا ئەگەرچی خۆریش دەر هاتبێ، هێشتا دەتوانێ نیەت بێنێ. ژنێ کە لە عادەت بێ یان زەیسان بێ، دەتوانێ هەر بە شەو نیەتی لێ بێنێ و لەبەری بەیانێ بڕوا و غوسڵەکەی جێبەجێ کا. ڕۆژوو لە بەرێ بەیانەوە دەستێ پێ دەکا تا ئەو وەختەی ڕەشی و تاریکی، ئاسمان دەگرێتەوە. سواو و گەورەی مانگی ڕەمەزان زۆرتر لەوەیە کە لەم ئامیلکەیە جێ بگرێ یان ئێمە بتوانین بیڵێین. سواو و جەزای ڕۆژگیش خودا دەیداتەوە کە لە حەدیسی

---

١- مەبەس ئەمەیە کە بە ڕۆژا نزیکی حەرامە.

تودسیش هاتووه «کل عمل بني‌آدم له الا الصوم و انا اجزي بة»[١] سواوی ڕۆژووە سوننەتەکانی پێنجشەمە و دووشەمە و عەرەفە و عاشوورا و تاسووعا و ایام‌البیض[٢] یەکجار زۆرە و لە کتێبە گەورەکان باسی زۆری لێ کراوە. هەروەها ڕۆژگەوانی سواوی زۆری لەبەرە کە لە کابرای صائم‌الدهر یانی ئەو کەسەی هەمیشە بە ڕۆژووە زۆرترە. وەلێ ڕۆژووی ویسال (وصال)[٣] حەرامە. چونکە ڕۆژووی سوننەت لە فرووع ناگونجێن و ئێمەش دەمانەوێ لەم نامیلکەیە بە تایبەتی باس لە واجیبات کەین، شەرح و لێکۆلینەوەی هیچکام لەمانەمان نەنووسیوە. بە ڕاستیشدا و شوێن سوننەتی حەزرەتی ڕەسوڵ کەوتن، زۆر فرەتر لەوەیە کە بە کتێب و شەرح تەواو بێ.

---

١- واتە: هەموو ئیشەکانی بنیادەم بۆ خۆیە جگە لە ڕۆژوو کە من خۆم جەزای ئەدەمەوە البخاري شارە ٥٤٧٢ عن ابي هريرة رضي الله عنه عن النبي صلي الله عليه و سلم قال كل عمل ابن آدم له الا الصوم فانه لي و انا اجزي به و لخلوف فم الصائم اطيب عندالله من ريح المسك

٢- ایام البیض بریتیە لە سێ ڕۆژی سیازدە و چواردە و پازدەهەمی مانگی قەمەری.

٣- ڕۆژوی ویسال (وصال) ئەوەیە کەسێ بە بێ ئەوە ڕۆژووەکەی بشکێنێ ڕۆژی دوایش بەڕۆژوو بێ. واتە دوو ڕۆژ یان زیاتر هیچ نەخوا کە ئەمە حەرامە مەگەر بۆ پێغەمبەری ئیسلام دروودی خوای لەسەر بێ.

زەکات لەسەر ماڵ واجیب دەبێ. پیاوی باش و بە خوا ئەوەیە کە لە دانی زەکات بە پەلە بێ و لەم بابەتە کۆتایی نەکا. چونکە دانی زەکات دەبێتە هۆی ئەوە کە ماڵ پڕ لە پیت و بەرەکەت بێ و ماڵیش زیاد بێ. بۆ نموونە وتوویانە کە ئەو ماڵەی زەکاتی نەداوێ، وەکو ئەو چێشتەیە کە کەف و پیسی بانی گرتووە. هەروەها کە لابردنی کەف و پیسی چێشتەکا خاوێن دەکا، بە هەمان جۆر زەکاتیش ماڵ و حەشیمەت خاوێن دەکا و دەبێتە هۆی زیادبوونی دەوڵەت و دارایی، کە خودا فەرموویەتی: «قد افلح من زکیها» واتە بە ڕاسی ئەو کەسەی دڵ و ماڵی خۆی خاوێن کا، ڕزگار دەبێ.[1]

زەکاتی ماڵ بەم جۆرەیە کە:

لە هەر پێنج مسقاڵ ئاڵتوون، نیو مسقاڵ، و لە سەد و بیست مسقاڵ

---

[1] - جاریکی دی دووپات دەکەینەوە کە بەم کتێبە نابێ فتوا بدرێت بەڵکو هەموو شتێکی بە درووست بزانن.

نوقره، نیو مسقالێ، و له بیست و پێنج وشتر، کاوڕە وشترێ، و له سێ سەر ڕەشەولاخ، دەبێ گوێرەکە نێرێك و له چل سەر مەڕ، تاقە مەڕێك بە زەکات بدات تا ببێتە هۆی پاکی و خاوێنی ماڵەکەی. له دەخلێ و دانیشدا گەنم و ئەو قووتەکانی‌تر بە یەك لە دە واجیب دەبن. له میوەشدا له خورما و مێوژ زەکات واجیب دەبێ، ئەویش یەك لە دە. مامۆستای پایەبەرز و زانای گەورە مەلا ئەبووبەکری موسەنیفی چۆڕی فەرموویەتی[1] کە توتیش بە قووت حسێب دەکرێ و زەکاتی واجیبە.

---

١- زانای پایەبەرزی کورد کە لە ٩٠٩ مانگی لە ناوچەی کەلاتەرزانی سنە بە دنیا هاتووە و لە ٩٩٤ لە دێی چۆڕ سەر بە مەریوان کۆچی دوایی کردووە. زانایێکی نایینی زۆر گەورە بووە و بە عارەبی و فارسی چەند کتێبی باشی هەیە. ﴿الوضوح﴾ ﴿طبقات الشافعية﴾ ﴿آفتاب﴾ ﴿سراج الطريق﴾ و ﴿رياض الخلود﴾

چوارەمیــن فەرع لە فورۆعی ئاییــن، حەجی ماڵی خودایە کە لەسەر هەموو موسوڵمان واجیبە، بەس نە بە فەرزی عەین[1] کە لە پێشدا باسمان لێ کرد. کە نوێژ فەرزی عەینە و بە هیچ کاتێکدا لانابرێت و هیچ بروبیانوێکی لێ قبووڵ نابێ. تەنانەت لە کاتی نەخۆشی و ناساقیشدا بە نیشارەی چاویش بێ دەبێ بخوێنرێت. ڕۆژگیش فەرزی عەینە. کە فەرزی عەینە کە شەرتی ئیسلام و جەحیلی (توانایی) و قـوەتی دەوێ. ئەمـــا حەج فەرزێکە کە ئەگەر بە عەمەلیش نەیت، دەبێتە هۆی قەزا کردن و کەفارەی دەوێ.

ڕۆیشتن بە ماڵی خودا چەند پێویستییێکی دەوێ کە پێویستیە تایبەتەکانی بریتین لە چوار شت:

یەکەم: ئەوەیە کە مەسرەفی چوون و گەڕانەوەی بێ

دووهەم: ئەوەیە کە بە هۆی توانای خۆی بارگینێ یان چاروایێکی بۆ سەفەر

---

[1] - لەم باسەدا خاتوو مەستوورە بە ڕووناکی باسی لێ ناکا و بگرە تووشی هەڵەش بووێت.

وەدەس کەوێ

سێهەم: ئەوەیە کە ڕێگا ئەمن و ئەمان بێ. ئەگەر ڕێگا پڕ لە مەترسی بێ یان کابرا بۆ خۆی و ماڵی لە دوژمن بترسێ ئەوە ئیتر حەجی لە سەر واجیب نابێ

چوارەم: ئەوەیە کە کابرا بتوانێ خۆی بە سەر بارگینەکە بگرێ و توانای دانیشتنی بە سەریا بێ

پیاوی خێزاندار دەبێ بە ڕەزای خێزان و خەڵکی ماڵی بۆ سەفەر بڕوا و لەش و ماڵی بەو قەدەرە بێ کە بتوانێ ئەو بیا و بیڕێتیەو. نابێ خاو و خێزانی بە ئەو نیازێکیان بێ یان شتیان نەبێ بۆ گوزەران و دەبێ خۆیشی لێ قەوماو دەس خاڵی (مفلس) نەبێ، چ لە وەختی چوون و چ لە وەختی هاتنەوەدا. کەوابوو حەج لە سەر کابرای (مستطیع) واجیب دەبێ. ئەو ڕۆڵەیە کە هێشتاکە ژنی نەهێناوە یان شووی نەکردووە، نابێ بەبێ ڕەزای دایك و بابی بۆ حەج بڕوا. لە سەر ژنیش پێویستی (استطاعة) واجیبە بەو شەرتەی کە ئەگەر شووی هەیە ئەویش لەگەڵیا بڕوا ئەگەرچی کابرایش فاسق و خرابکار بێ. ئەگەر شووی نەبوو، دەبێ مەحرەمێکی شیری (رضاعی) یا مەحرەمێکی خزمی و نەسەبی یان بە زاوایی (مصاهرە) لە تەکیا بن کە بریتین لە خەزوورە ئەگەرچی ئەویش خرابکار و فاسق بێ. ئەگەر هەمووی ئەمانە لە هاوڕێیەتی ژنەکە کۆتاییان کرد، دەبێ ژنەکە ئەجر و کرێی ڕێگا بەوان بدات، ئەگینا دەبێ خۆی لە کەسێ مارە کا. ئەگەر هیچ مەحرەمی دەس نەکەوێ دەتوانێ بە

یارمەتی و لەگەڵ چەند ژنێکی باش و خۆش ناو بڕوا بۆ حەج و ئەگەرچی هیچیانیش مەحرەمی لە تەك نەبێ، ڕۆیشتنەکەیان دروستە. لەسەر پیاو یان ژنی کوێریش حەج واجیبە بەو شەرتەی (مستطیع) توانایی ببێ و کەسێ ببێ دەسیان بگرێ. ئەگەر کابرایەکیش حەجی لەسەر واجیب بوو، جا بۆ حەج نەڕۆیشت تا گیانی دا و مرد، واجیبە کەسێ دوای مردنی لە جیاتی ئەو حەج بکا. وەختی حەجیش بریتیە لە مانگی شەوال و ذیقعدة و دە ڕۆژی ذیالحجة. زانایان جێگای گەیشتنیەکەیشیان (میقات) دیاری کردووە کە لە شام و میسر و مەغریب دەبێ جەحفە بێ و لە مەدینە ذوالحلیفة و لە تهامە و یەمەن و یەلەملەم و نەجد و حیجاز لە خۆرئاوا و عیراق ذات کە ئەمانە عولەما و زانایان ناویان لێ بردووە.[1] باشتر ئەوەیە کە هەر لە ئەوەڵی میقاتەوە کابرا ئیحرام ببەستێ ئەگەرچی تا ئاخری میقاتیش جەوازی هەیە. میقاتی عەمرەیش وەکو حەج وایە. ئەگەرچی عەمرە حەج نییە.[2] چونکە حەج ویستان لە عەرەفاتی هەیە و عەمرە نییەتی. بۆ ئەو کەسەی ئیحرام دەبەستێ بە شەرت گیراوە کە بە دڵ و زوانی نیەت بێنێ کە ئەمن نییەتی حەج و ئیحرامم هەیە لە بۆ ڕەزای خودا. لە پاشان دەبێ بڵێت: «لبیك اللهم لبیك و سعدیك» کە ئەگەر تەلبیە کات واتە ئەمانە بێژێ و نییەتی لێ

---

[1] - باشترە بزانین کە ئەم شتانە لێرە بە ناو میقاتەوە ناوی هێناوە زۆر بە وردی باسی لێ نەکردووە و بگرە هەڵەیشی تیا بێ.

[2] - بە واتەی زانایانی شافیعی عەمرەیش لای کەم بۆ مستطیع جارێ واجیبە. ئەمە جگە لە واجیب بوونی خودی حەجە.

ئـەهێنێ ئیحـرام داناهـــەزرێ. غوســـڵ و خۆشـــۆردن بــۆ ئیحــرام ســـوننەته. هـەروەها ئـەو کاتـە دێتـە مەککـە یـان لـە کـاتی وێسـتان لـە عـەرەفات سـوننەتەکە غوسـڵ کـا. باشتـرە کـە لـەش و سـیپاڵی لـە ئیحرامـدا، بۆنـخۆش کـا و ژن دەتـوانێ لـە ئیحرامـدا دەمـی لـە خەنـە بگـرێ. سـیپاڵی ئیحـرام ئـابێ دووراوە بـێ و پۆشـینی (ردا)یکـی سـپی واجیبـە. لـە دوای ئیحـرامیش ســوننەته کـە دوو ڕەکعـات نوێـژی ئیحـرام بـەجێ بێنێ. ئەگـەر کەوشـی (نعلیـن) بـێ عـەیبی نییـە. سـوننەته کـە زۆر تەلبیـە کـا و دەنگـی بـۆ تەلبیەکـە بـەرز کاتـەوە. جگـە لـە ژن کـە دەبـێ بـە سـووکی و ئـەهوەنی و بـە دەنگێکـی زۆر ئـارام تەلبیـە بێـژێ. وشـەکانی تەلبیـە ئەمانـەن: «لبیـك اللـهم لا شـريك لـك ان الـحمد و النعمـة لـك و الـملك لا شـريك لـك»[1] لـە دوای تەلبیـە سـوننەته کـە سـەڵاوات بنێـرێ بـۆ پێغەمبـەری مـەزن. هـەروەها سـوننەته کـە لـە خـوا داوا بکـا بیبنێـرێ بـۆ بەهەشـت و لێـی ڕازی بـێ و لـە ئـاگری جەهەنـنـەمیش بیپـارێزێ. بـۆ کەسـێ کـە ئیحرامـی بەسـتووە باشتـرە کـە هێشـتا بـە عـەرەفات نەگەیشـتووە، بـڕوا بـۆ مەکـە و غوسـڵ کـا و لـە ڕێگەیشـدا «لبیـك» بێـژێ و بێتـە نێـو شـاری مەکـە. وەختـێ مـاڵی کەعبـەی دی ئـاوا بڵێـت: «اللـهم زِد هـذا البيـتَ تشـريفاً و تعظيمـاً و تكريمـاً و مهابـةً و زد مـن شـرفه و عظمـه مـن حجـه او اعتمـره تشـريفاً و تعظيمـاً و تكريمـاً و بـراً اللـهم انـت السـلام و منـك السـلام فحينـا ربنـا بالسـلام»

---

١ - البخاري ژماره ١٤٤٨ عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما ان تلبيه رسول الله صلي الله عليه و سلم لبّيك اللهم لبّيك لبّيك لا شريك لك لبّيك إنَّ الحمد و النعمه لك و الملك لا شريك لك

سوننەتە کە لە دوای دوعا، لە دەرکی بەنی شەیبە بڕواتە نێو مزگەت و تەوافی قودوم ئەنجام با کە تەوافی قودوم تایبەتی بە کەسێکی هەیە کە بێتە مەککە بۆ حەج کردن کە پێش عەرەفات سوننەتە. زانایان پێیان وایە کە ئەو کەسەی بۆ مەکە دەڕوا نە لەبەر عیبادە و خوداپەرەستی ئیحرام بە حەج یان عەمرە ببەستێ و بڕێ لە زانایان وایان وتووە کە ئەمە واجیبە و سوننەت نییە. ئەو شتانەیتر کە تایبەتیان بە حەج هەیە، حەوالەی دەکەینە کتێبە گەورەکان کە لەم نامیلکە چکۆلە جگە لەمە جێگای نییە و بۆ منیش زۆرتر لەمە ناکرێت.

سەلی خەتمیش بەکار بێنێ و لە هەر سێ جار شۆردنەکەدا دەبێ کافوور بە کار بێنی کە سوننەتی ڕەسوڵ اللهیە. لە دوای ئەمانە بە ئاوێکی ڕەوان و سەرد کە بۆ یەکەم جار بە کار دێت (غیر مستعمل) مردووەکە ئاو بکێشێ و لە دوادا لە کفنی کا. ئەگەر لە دوای شۆردنەکە شتێك لە بەر یا دوای مردووەکە هاتە دەرێ پێویست نییە غوسڵ و دەستنوێژەکە دووپات کاتەوە، جگە لە شۆردنی جێگەی پیسی. بزانە کە شۆردنی مردوو، نییەتی ناوێ. کەوابوو دەشکرێ موسوڵمان، کافر یان کافر، موسوڵمان بشۆرێ و هەر بە هۆی ئەمەیە کە کابرای خنکاو لە ئاوا شۆردنی ناوێ. واجیبە کە ژن شووی خۆی بشۆرێ، و شوویش ژنی خۆی بشۆرێ. دەبێ خاوەنی عەبد و نۆکەر، بەندەکەی بشۆرێ. بەو شەرتەی دەستکێش لە دەست کات، تا دەستنوێژەکەی بەتاڵ نەبێتەوە. ئەگەر ژنێ لە جێگایەکدا مرد کە لەوێ هیچ ژنێك نەبوو، یان هیچ کەسێ نەبوو کە بە ژنە مردووەکە مەحرەم بێ، دەبێ تەیەممۆمی بکەن. بزانە کە لە هەر کام لەم شتانە کە ئێمە باسمان لێ کرد باسی زۆرتریشی لە سەرە، بەس ئێمە هەر بەم نامیلکە چکۆلە پەسەندمان کرد تا بە خوێندنی ئەمە کورتە مەسەلەکان جواو بدرێتەوە. خوا باشتر دەزانێ کێ لەسەر ڕاستیە.

درووود و سڵاوی خوا لە سەر ڕێبەرانی ڕێگای هیدایەت و دروستی و هەروەها سڵاوی خودا لە سەر حەزرەتی موحەممەد و دۆست و یاران و خزم و کاری.

مردووەکە بە جوانی بشۆرن و تەواوەکەشی ئەوەیە کە غوسلی مردووەکە لە جێگایێکی ڕاست و بێهەوراز و نشێو وەکو چوارپایەیەک یان لە سەری ڕاسایی حەمام دانێن و کابرای مردووشۆریش دوو دەستکێشی دووراو کە خاوێن بن بێنێ و مردووە کە لەو جێگایا داینێت و پالی باتەوە. لە دوادا کابرای مردگشۆر، دەستی ڕاستی بە شانی ڕاستی مردووەکە بێنێت بە جۆرێ کە قامکی نیشارەی بە پشتی ملی مردووەکە بکەوێ و پشتی مردووەکەش پال باتە ڕانی خۆیەوە و دەستی چەپی چەند جار بساوێتە سکی مردووەکە و بیشێلێ تا ئەگەر پیسی و شتێکی وای لە سکی مردووە کە مابێتەوە، بێتە دەرێ و لە دوادا یەکێ لەو دەستکێشانە بکاتە دەستی چەپی و تەهارەتی مردووە کە بشۆرێ بەو جۆرەی لە وەختی زیندوویەتی دەکرا. لە دوای تەهارەتی مردووەکە، ئەو دەستکێشە کە، لە دەستی ڕاستی کا و دەسنوێژی مردووەکە بگرێت. بەو جۆرەی کە لە کاتی زیندووبوونا دەسنوێژی دەگرت. جا ئەو دەسنوێژە سوننەتە. وەلێ واجیبە کە قامکی بخاتە بێخی نێو ددانی مردووەکە و چەند جار قامکی بساوێ تا ددانی پاك بێتەوە. ئەگەر مردووەکە ژن بێ دەبێ سەر و ڕووخساری بە سدر و سملێ بشۆرێ، ئەگەریش پیاو بێ دەبێ سەروریشی ئەویش بە سدر و سملێ بشۆرێ و بە شانەیێکی ددان گەورە، سەر و ڕیشی شانە بکا بە جۆرێ کە مووەکانی ڕزیاگی کە ئەگەر چەند مووییێك لەسەر و ڕیشی مردووەکە ڕزا، دەبێ بێنێتە جێگەی خۆی. لە دوادا دەبێ مردووەکە بە پشتا بیخەفێنێ و لە پێشدا لای ڕاستی بشۆرێ. لە دوادا لای چەپیشی بشۆرێ و لە پاش ئەمەش بە دەمەو بیخەفێنێ. بە هەمان جۆری ئەووەڵ لای ڕاست و لە دوایشدا لای چەپی بشۆرێ. لە شۆردنی یەکەمدا

کە دروستە واتە بێژێ «نویت رفع حکمالحیض و الجنابة» یا «حکم الجنابة و الحیض» یان «و النفاس». ئەگەر بە جیاجیا غوسڵ کات ئەویش هەر دروستە. برێ لە زانایان وتوویانە ئەگەر لە پێشدا لەشپیس بوویێت و لە دوادا تووشی عادەت هاتبێ دەبێ بەکەم نیەتی غوسڵی جەنابەت کا و بڵێت: «نویت رفع حکم الجنابة و الحیض» و ئەگەر پێش لە جەنابەت تووشی عادەت بووبێ دەبێ لە پێشدا نیەتی عادەت بێنێ. بەڵام زانایانی پایەبەرز وتوویانە، جیاوازی نیە کە کامیان لە پێش بێ و کامیان لە دوا بێ، هەر کامیان لە پێشدا بیڵێت ئەوە عەیبی نییە و دروستە. لە زەیسانی و لەشپیسیشا هەر وایە.

هەروا کە لە پێشدا وتمان لەسەر ژنی زەیسان و ژنی تووشی عادەت واجیبە کە لەو ماوەیە کە خوێنی ئەبڕێتەوە دەبێ غوسڵ بکا و خۆی بشۆرێ، و دەبێ فەرزەکان بەجێ بێنێ و دەشکرێ ژنی تووشی عادەت یان کابرای لەشپیس، نیەتی ڕۆژووی ڕەمەزان هەر بە شەوا بێنن و لە ڕۆژا غوسڵ بکەن. ئەگەر ژنێک زەیسانیە کەی بە درێژا چوو، واتە لە چل ڕۆژ تێپەڕی و ئەبێتە «مستحاضە» ئەوە ئیتر ڕۆژگی لەسەر فەرز و واجیب دەبێ.

**بەشی دووهەم: شۆردنی مردوو**

شۆردن و کفن و دەفنی مردوو فەرزی کیفایەیە. بزانە کە سوننەتە کە دەبێ ئەو کەسەی مرد کەس و کاری بە چالاکی و بە پەلە بیشۆرن. شۆردنی لەشی مردوو بە دوو جۆرە. جۆری لای کەم (الاقل) و جۆری تەواو (الاکمل)

لای کەمی ئەوەیە کە بە دوای لابردنی چڵک و پیسی (حدث و خبث) لەشی

بە لۆکەیکی خاوێندا و لە جێگەی خۆی دابنێ و زوو دەسنوێژەکەی بگرێت و نوێژەکەی بەجێ بێنێ. ئەگەر لەم کاتەدا، خوێنی ڕژایە دەرێ، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ ناکا و بە هیچ جۆرێ نابێ بەم بیانووە نوێژ و ڕۆژگ و ئەو واجیباتیتر، بەجێ نەهێنێ.

زەیسانی (نفاس) ئەوەیە کە منداڵ بێتە دنیا، کە لە شەرعا، لای کەمی ئەوەیە کە منداڵەکە داکەوێ و خوێنی لەتەك خۆیا بهێنێ. زۆرترین زەمانی زەیسانی چل ڕۆژە. ئەگەر ژنێك پڕ مەوو و کولکن بوو، و زۆرتر لە چل ڕۆژ زەیسان بوو و خوێنی لێ دەهات، ئەگەر لە چل ڕۆژیش فرەتری پێچوو، ئەویش هەر (مستحاضە)ی پێ دەڵێن، و هەروەها کە لە باسی عادەتی ژنان دا باسمان لێ کرد، واجیبە ئەمیش تەکلیفاتی شەرعی بەرێوە بەرێ وەکو نوێژ و نزیکی لە تەك شووەکەیدا. ئەگەر لە بەینی ئەم چل شەوەدا خوێنەکەی بڕا، غوسڵ و نوێژ لە سەری واجیب دەبێ.

لە وەختی لەشریسی و عادەت و زەیسانیدا بە واتەی قورئان کە دەفەرموێ: «لا یمسە الا المطهرون»[1] دەس دان بە قورئان یان نوێژ خوێندن دروس نییە مەگەر وشەیك لەبەر بێت و بەرەکەت بە زارا بێنێ.

بۆ غوسڵی عادەت هەر ڕۆژێ کە بیەوێ دەتوانێ غوسڵ کا و خۆی بشۆرێ بۆ نموونە ڕۆژی سێهەم یان چوارەم یان پێنجەم، تا ئاخری کە ڕۆژی پانزدەهەمە.

ئەگەر ژنی غوسڵی عادەت و جەنابەت، یان غوسڵی زەیسانی و جەنابەتی لەسەر واجیب بێ، یا نییەتی هەر دوو بە یەکەو بێنی و لە دوادا غوسڵەکەی بکا

---

١ - الواقعە/٧٩ بێجگە پاکان کەس ناتوانێ دەستی لێدا. (هەژار)

نیـــن حەجەر فەرموویەتی: «و الرجل لن یؤخرا» واتە پا بـە دوادا ناخرێـت. لـە دوای دەســنوێژ گرتن بەرەو قیبلە ڕاوەستێ و لە مەنجەڵێکا کە یـەك مـەن نـاوی تێدا جێ بێتەوە، یەکەم سێ قاپ بە لای ڕاستی خۆیدا بکا و بە دوادا سێ قاپـیش بە لای چەپی داکا و سێ قاپـیش بڕژێنێتە سـەریا. نیـیەتی غوسـڵیش ناوایـە کـە «نویت رفع الـخبائث» واتە دەمەوێ خوێس و لەشپیسی لە خۆ لابەم.

ئەگەر ئەو ژنەی کە لە عوزری شەرعی دایـە بیـەوێ غوسـڵ بکـا دەبێ لـە نیـیەتەکەی دا وشەی (حیض) بێنێ و ئەگـەر دەیـەوێ کـە لـە زەیسـانی (نفـاس) دەرچێ، دەبێ وشەی نەفاس بێنێ. یەکـەم دەبێ نیـەت بهێنێ بـە دوادا. دەبێ ئاوەکە بڕژێنێتە سەر و شانیا. بۆ ژنیش چوار شت هەن کە غوسـڵ واجیب دەکەن. لـەشپیسی (احـتلام) و دەرچـوونی مـەنی و لـە عـادەت دەرچـوونی و زەیسـانی (نفاس). لەشپیسی لە ژنا وایە کەخەونا ببینێ کە لە تەك پیاوێکا خەوتووە. لـە دوادا لە خەونەکە کە بێدار بێتەوە، دەبینێ لەشیپیس بووە. ئەوە غوسڵ واجیب دەکات. دەبێ ژن ئەندازەی عادەتی خۆی بزانێ. ژنان لە عەمری نۆ ساڵە تووشـی عادەت دەبن لە دوادا کەمتـرین مـاوەی عـادەتی شـەو و ڕۆژێکـە، و زۆرتـرینی شەش ڕۆژ و شەوە. هەروەها کە زۆرێ ژنان عادەتیان وایە کە لە ڕۆژی حەفتەمـدا غوسـڵ دەکەن، و ئەندازەی زۆریشی پانزدە ڕۆژە. ئەگەر لەو ئەندازە زۆرتر بـوو، و بیسـت ڕۆژ یان کەمتـر، یان زۆرتری خایاند، زانایانی شەریعەت بە ئەو ژنە ئێژن، ژنی (مسـتحاضـە) کە برێ تەکالیفی تایبەتی دەوێ. ئەگەر لەو وەختەدا بیەوێ لە تەك شووەکەی نزیکی کا، ئەوە دروسـتە و عەیبی نییە. دەبێ نوێژەکەشـی بـەجێ بێنێ و بەم جۆرە پاك بێتەوە. لە دوادا لە بۆنی خۆش و سـەڵ و عەبیـر بسـاوێ

**بەشی یەکەم: شۆردنی زیندوو**

دەبێ بزانی کە لە غوسڵدا چەند شت هەیە کە بۆ ژن و پیاو دەبنە هۆی غوسڵ واتە دەبنە هۆی ئەوە دەبێ ئینسان هەموو لەشی بشۆرێ. بۆ پیاو لەش پیسیە (احتلام) و دەرچوونی «مەنی» و پێکگەیشتنی شەرمی ژن و پیاو، واتە ئەگەر کەسی بە کەسی دیکە کارێ بکات کە یان «مەنی» بێتە دەرێ یان نە، هەر ئەوەندە بچێتە نێو، غوسڵ واجیب دەبێ. غوسڵیش بەم جۆرەیە کە یەکەم دەبێ پیسی و خویس و حەدەس لە هەمووی لەشی بشۆرێ و لای بات. لە دوادا بەو جۆرە کە بۆ نوێژ کردن پێویستە دەبێ نیەت بێنێ و دەسنوێژ بگرێ. برێ لە زانایانی ئایینی وتوویانە کە ئەو دەسنوێژەی کە بۆ غوسڵ دەبێ بگیرێت، نابێ ئەوەڵ پای تیا بشوا، بەڵکو دەبێ دوای غوسڵەکە بیشۆرێ. ئیبن حەجەر و زۆربەی زانایانی ئیجتیهاد وتوویانە کە دەبێ هەر لە پێشدا پایشی بشۆرێ. کە

# بەندی سێهەم:

# باسی غوسڵ

بەشی یەکەم، شۆردنی زیندوو، و بەشی دووهەم شۆردنی مردووە.

بێنێ، بەس نیەتی ئەمە بێ کە دەرۆم با بکوژرێم و شەهید بم، ئەگەر بکوژرێ، بە شەهید ناناسرێ و لە ئایین دوورە. ئەوەی واجیبە ئەمەیە کە بە جوانی لەسەر ئەم بڕوا بێ کە دەرۆم و بەندەکانی خودا کە لە زەریای کوفرا قەتیس ماون، ڕزگاریان دەکەم و هانیان دەدەم بەرەو خودا و پێغەمبەر و ڕێگەی ئایینیان پێ نیشان دەدەم. ئەگەر نەمتوانی ڕێگایان پێ نیشان دەم و نەهاتنە سەر ڕێگای ڕاس، لە دوایدا دەس بە کوشتن و جیهاد ئەدەم. بەڵگەی دروسی ئەم قسەیە ئەوەیە کە کەسێ لە ڕێگەی خودا شەڕ کا، واجبە ئیمام لە بەیتولماڵ و زەکات و سەرویترە خەرجی بدات. وەلێ ئەگەر کەسێ بیەوێ خۆی بکوژێ لە سەر ئیمام واجیب نیە خەرجی بدات و وەکو شەهیدیش ناناسرێ.

پێنجەم جیهادە: بە واتەی قورتان، «و فضل‌الله المجاهدین علی‌القاعدین اجرا عظیما»[1] جیهاد پاداشێکی هەرەبەرزی لەسەرە، بۆ کەسێ کە لەبەر ڕەزای خودا و پێغەمبەری خودا لە ڕێگای ئەوانا جیهاد بکا و لە ئەو ڕێگایا بڕوا کە ڕێگای ئایینە، و گیانی لێ خەلات کا. ئەگەر کەسێ بە ئیمان و بڕوا، بۆ حەج بڕوا، دەبێتە هۆی ڕەزامەندی خودا و ڕەسوولێ. جیهادیش شەرتی هەیە کە واجیبە کابرا ئەسڵی ئایینی خۆی بزانێ و فەرعی ئایینیش وەکو نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و شتی وا بەجێ بێنێ. ئەگەر کەسێ نوێژ نەکا و ڕۆژوو نەگرێ و ئەسڵ و فەرعی ئایینی خۆی بەجێ نەهێنێ، ئەوە ئیتر جیهاد لەسەری واجیب نییە و جیهادیشی لێ قوبوڵ نابێ. ئەگەر کەسێ بە ئوسوڵی ئایین شارەزا بێ و فورووعیش بە کار

١ - النسا /٩٥/ واتە: «ئەوەی لە مەیدانی خەزادا بن، لە چاو خانەنشینەکان پاداشێکی هەرە سەرزیان دەداتێ» (هەژار)

